# مووناجات

(مەولەوی)

باعیس وجوود جە ماە تا ماهی
دەلیل ئیسبات سونع ئیلاهی

زیای بینایم ، نوور چەمانم
سەرمایەی حەیات دین وئیمانم

من وێم مزانوو بێ ئەمریم کەردەن
ئیتاعەی فەرمان عەبدیم نەبەردەن

عومرم سەراپا غەرق غەفلەتەن
زاد ئاخرم بار خەجلەتەن

بەلام مشیۆ تۆ وە فەزلەکەی وێت
کردەی من نەبۆ بەهانە پەرێت

ئیغماز کەی جە گرد نابەکاری من
جە رووسیایی و بەدکرداری من

پەی من کافی یەن ئەی گرد ئینفیعال
بۆ بە رەحم وێت بکەرەم پامال

مەدیە وە تۆمار کردەی وێم دەم
بدیە وە زەردی روخسار ئاوەردەم

هەرچەند شایستەی عەفوت نەداروون
رووی شەرمەندەگی وە دەرگات ماروون

جە بەحر کەرەم بێ بەشم مەکەر
شەڕ نەفسانی جە راگەم لابەر

تا بە فەزل وێت بوانیمەوە
جە دەس هەوای نەفس بسانیمەوە

بەلکم جەی ئاخر پەی وێم فکرێ کەم
تەدارەک پەی چەند تەزبێح زکرێ کەم

بەلام بەو شەرتە چەنیم قبوول کەی
بەهانەی ئەسباب عەفوم وسوول کەی

نەفس بەدکردار ، بێ دین بەدبەخت
شووم سەرگەردان خەیالات سەخت!

پەی چێش عادەتت وەگوناە کەردەن
ژار مەحروومی رەحمەتت وەردەن

راگەی حەقیقەت جە ویرت شیەن
یادت پەی مەحبووب حەقیقی نیەن

مەوتەن ئەسڵیت نە خاتر لوان
مێخ مۆبەتت نە رووی خاک کوان ؟

دایم گرفتار ئارەزووی خامی
یەکسانەن پەرێت نیکی وبەدنامی

گا خەریک دەرد هەوای مەجازی
گا مەشغوول کەسب کیبرو نیازی

گا غەرق هەوای وەسڵ نازاری
گا حیرەت زەدەی روخسار یاری

هیچ هۆشت نیەن حەق خەبەردارەن
فەردا رۆی حیساب میزان کارەن

فکرێ کەرەوە ، وادەی لواتەن
وەخت شێویای شەوق سەوداتەن

باوەرە وە دەس زادێ پەی سەفەر
وێت نەو سەفەردا بێ تۆشە سەکەر

وە دەرگای حەق بەر رووی پەشیمانی
عوزرئاوەری کەر کردەی نادانی

بەڵ لیباس عەفو بکەرۆت خەلات
جە وەخت مەردەن بدەرۆت نەجات

وە نسیوت بۆ سەرمایەی ئیمان
نەوی وە ریشخەند سوخریەی شەیتان

وە رۆی مەحشەردا بگێڵی دڵشاد
جە قەید عیسیان دڵت بۆ ئازاد

# ناوەڕۆک



گۆواری ئەدەبی ـ فەرهەنگی

**سروە**

ناونیشان: ارومیه ـ چهارراه دانش ـ جنب ژاندارمری ـ مرکز نشر فرهنگ و ادبیات کردی: انتشارات صلاح الدین ایوبی.
تلفن ۲۵۸۰۰

چاپ: از شرکت ایرانچاپ
تلفن: ۳۲۸۱


بەناوی خوا

قسەیەک لەگەڵ خوێنەرانی بەڕێز

وێڕای سڵاو، سەرکەوتنی هەموولایەک بەئاوات دەخوازین هەر وەک دەزانن بەدەرچوونی ئەم ژمارەیە "سروە" دووەمین ساڵی ژیانی خۆی هەڵدەبوێرێ. دووساڵ کە سات بەساتی پڕلە حەول وتێکۆشان وبەربەرەکانی لەگەڵ گیروگرفتەکان بوو. ئەم دووساڵە قەڵەم لە حەول وتەقەلادا بوو بەڵکوو بتوانێ قەرەبووی سووچێک لە بێ بەشی مێژوویی ئەم گەلە بکاتەوە. دووساڵی پڕجموجووڵ وهیوا وهومێد، ئەنگیزەیەک بوو بۆشکاندنی تەلەسمی دێوەزمەی زوڵم وزۆر، جەژنی پچڕانی زنجیری رزیوی کۆیلەتی لەدەست وپێی ئەوانەی کە زۆرلێکراوی و بەش خوراوی یان بارمەهای درێژەدانی حکوومەتی ئەو نامەردە لامەزەبانەیە کە شەرەفی ئینسانەتی لە لایان بێ مانا بوو وبۆ عەیش و نۆشی زۆرتر ژیانی هەزاران ژن وپیاو وگەورە وبچووکیان کردبوو بەژار. بەڵێ ئەم دووساڵە بۆ مێژووی ئێمە

دووسەدەنا دووهەزار ساڵ بوو بەڵام لەم دووساڵە پڕتێکۆشانە ـ دا هێزێک دنەی دەدایـن باری قورسی کاروگیروگرفت بەلامانەوە سووک بێ ولە گەڵیان هەڵکەین . ئەویش هەستی رەزامەندی وپشتیوانی وچاوەڕوانی ئێوەی ئازیز و بەڕێز بوو . ئەگەرچی لە کۆمەڵە نامەکانی خۆتاندا شانازی بەڕێوەبردنی ئەم جووڵانەوە مەزنەفەرهەنگی یەـ تان بەئێ ئێمە دەزانی بەڵام دەبێ دان بەوەدا بێنین کە ئەگەر پشتیوانی ولایەنگری ولوتفی ئێوە نەبوایە، قەت نەماندەتوانی بەری ئەم نەمامە پیرۆزە بەچاو ببینین ئێمە لەبەرامبەر ئەم هەموو لوتف وخۆشەویستی یەدا چمان نیە پێشکەشتانی بکەین تەنیا ئەوەمان لەدەست دێ چەندی پێمان بکرێ بۆ گەشە ونەشەی ئەم نەمامەپیرۆزە تێبکۆشین

کە دەستمان بە کار کرد پێمان وانەبوو لە ماوەیەکی کورتدا دەتوانین گۆوارێک بەم چەند وچۆنەوە دەربکەین بەڵام هەوەڵ ژمارەی سروە پێشاندەری پێشوازی ولایەنگری خەڵک بوو ، پێشوازی یەکی بێ وێنە . هەزاران سروە لە ماوەیەکی کەمدا نەیاب بوو . سروە وەک شەپۆلێک بڵاو بۆوە سنوور وکەوشەنی هەڵبوارد و لەهەموو شوێنێکی ولات و زوربەی ولاتانی دەرەوە بە دیداری دۆست وبرادەران شاد بوو .ئەم بڵاو بوونەوەیە لە هەل ومەرجێکدا بوو کە کەمترین تەبلیغاتی بۆ نەکرابوو ، زۆرکەسیش هێشتا نەیانزانیبوو . ئەوددەم پێمانزانی کە قورسایی سەرشانمان سەدهێندەیە پەیمانمان بەست تا وەدی هێنانی ئاواتەمێژوویی یە ـ کانی گەلی خۆشەویستمان دەست لەتێکۆشان شل نەکەین . مامۆستای خوالێ خۆشبوو ئالا هەڵگری ئەم خەباتە لە حالێکدا فرمێسکی شادی تک تک بەرەوپیری ئەم فەرمایشانەی دەچوون،دەیگوت: "ئەگەر عومرێک مابێ لە پێناوی ئەم رێبازەم ناوە"

دوای بڵاوبوونەوەی هەوەڵ ژمارەی سروە کاروانی پیرۆزبایی وپەیام و وتار و شیعر بەرەوناوەند بەڕێ بوو . کاروانێک کە لە هەموو شار و شارۆچکە وگوندێک ، لە هەموو کووچەو کۆڵانێک موسافیری بوو . کاروانێک کە ئەوین و لوتف ودنەدان وهاوکاری و پشتیوانی وچاوەڕوانی داهاتوویەکی باشتروروونا کتر هاوسەفەری بوو . ئێمە لە سەرمان بوو بەرەوپیری ئەو میوانانە بچین ومیوانداری یان لێ بکەین . بەڵام بەدەستی بەتاڵ ونەبوونی ئیمکان و کەمئەزموونی چمان پێدەکرا ؟

یارمەتیمان لە خوداویست کەلکمان لەدیاری مەعنەوی خوێنەرە پڕشۆرودڵسۆزەکان وەرگرت ودەستمان بە ژمارە دوو کرد . بەمحالە کە ئێمەی تێدا بووین لێمان روون بوو کە ماوەی دەرچوونی سروەی (۱و۲) لانی کەم سێ مانگە ، بۆیە بڕیارماندا تا هەل و مەرجێکی باشتر پێک دێ سروە بەسێ مانگ جارێک دەربکەین . بەم شێوە گۆوارەکەمان بەرە بەرە بڵاو کردەوە .

لە ساڵە وەختی سروەدا مامۆستاهێمن بەجێی هێشتین و زەبرێکی توندی لە کارەکەماندا وتا رادەیەکی زۆر وەپاش کەوتین .بەڵام بە یارمەتی خودا و هیممەتی دۆستان وخوێنەران ژمارە پێنج مان (ئەگەرچی درەنگ " لە تیراژێکی زۆردا بڵاو کردەوە ولە ماوەیەکی کەمدا نەیاب بوو .

لە حالێکدا هەموو حەول ودەولمان بۆباشترکردنی وەزع وبەهێزترکردنی بناخەی کار بوو ،پەیمانمان دا سروە بە وەختی خۆی بگاتە دەست خوێنەران بەڵام کەمبوونی کاغەز وزینک لە بازاڕدا کۆسپی هەرەگەورەی سەر ، رێگامان بوو . سەرەڕای تێکۆشانێکی زۆر بۆ ئەوەی هەنگاومان خۆشتر بێ بەداخەوە سروەی ژمارە شەش لە هەموان درەنگتر گەیشتە دەستخوێنەران چوون

زۆریشیان چاوەڕوانی کێشابوو لە ماوەیەکی کورتدا ئەویش تەواو بوو، لێبڕاین دیسان چاپی بکەینەوە. لەم نێوەدا سروەی ژمارە ٧ تەواو بووو دەستی خوێنەرانی ئەویندار و خۆشەویستەکانی ماچ کرد و ئێستا ئەوە دوامین ژمارەی ساڵی دووەمتان لەبەر دەستە کە هیوادارین درەنگ نەگەیشتبێتێ.

هەڵێکە وهەڵکەوتووە تا سەبارەت بەم هەموو کەم و کووڕی یە داوای لێ بووردن و چاوپۆشی بکەین. هەر وەک پێشتر راماگەیاندووە ئێمە چمان لەباراندا نیە تا ئەم هەموو لوتف و پشتیوانی یەی ئێوە قەرەبوو بکاتەوە، بەرجی ئەوە کە حەول بدەین سروە باشتر و پڕنێوەرۆکتر بکەین. لەم نێوەدائەگەر خوا یارێ و پشتیوانی بێدرێغی ئێوە درێژەی هەبێ (کە هیوامان بە هەردووک لا هەیە) عەزممان جەزم کردووە تا بە هیوای خودا لە ساڵی داهاتوو یانی لە ژمارە نۆوە سروە مانگانە دەربکەین. ئەمکارەهەرچەندە لەچاو وەزعی ئێستای ئێمە بەرزەفڕییە بەڵام لەبەرامبەر لافاوی داخوازی پەیتا پەیتای بەزمان وبەنامە وتەلەفونی ئێوە بچووکترین کارێکە کە لەدەستمان دێ وبە ئەرکی سەرشانی خۆمانی دەزانین. بەمجۆرە سروە دەبێتە مانگانە. ئەڵبەت رەنگ بێ کەمبوونەوەی ماوەی دەرچوونی گۆوار ببێتەهۆی کەمبوونەوەی لاپەڕەکانی بەڵام بە پێی ئەم بەرنامە کە بۆمان دارشتووە تێدەکۆشین لەباری چۆنەتی- یەوە گۆوارەکە بەرینە سەرو بابەتی جۆراوجۆری زۆر تێ باوێین (هەڵبەت وێرای پاراستنی مەبەستی فەرهەنگی ئەدەبی بوونی گۆوارەکە) و داخوازی ئەو بەرێزانە لە سەرچاو دابنێین و بۆ بانگەوازەکەتان بڵێین "سەددەق"

قەڵەم بەلاساری دەیەوێ بگەڕێتەوە شوێنی پێشووی خۆی کەوایە دەبێ بڵێین کە لە راستیدا بوون ومانی سروە و هەموو ئەم شۆڕشە پیرۆزە فەرهەنگی یە بە ئێوە و پشتیوانی ئێوە بەستەیە.

ئیمڕۆ بۆ هەموان بەتایبەتی بەڕێوەبەرانی سروە روون و ئاشکرایە ئەم جووڵانەوە، مەزنە بەکەسێک یا چەند کەس رانەوەستاوە وسەرچاوەی ژیانی دڵی پاکی خەڵک و ئەویندارانی رووت وبێ ریای ئەوە کە دیمەنی ئینسانی خۆیان لە بەرامبەر پەلاماری فەرهەنگی رۆژهەڵات ورۆژئاوا لەدەست نەداوە ونەیاندۆڕا- ندووە. ئەوان پێویستی یان بەناساندن نیە. لە هەموو شوێنێکی خاکی پیرۆزی کوردستان زانست ومەعریفەتی رەسەن وبایی‌داریان لە سینەدایە ولە تالان وبڕۆی رۆژگار پاراستوویانە. ماموستایانی گەورەی فەرهەنگ وئەدەبی کوردی - خوا ئاگاداریان بێ، لە گەشە و خۆگرتنی ئەم جیهادەپیرۆزەدا دەورێکی بەرچاویان بووە بەڵام ئەوەی ئەوانیشی وە جمو جووڵ خستووە ولەشی کەنەفت و کەلەلایانی حەێل کردۆتەوە و گیانی تازە ورووحی تازەی پێ بەخشیون، ئۆگری و یارمەتی وچاوەڕوانی دڵ و دەست وچاوی خەڵکە.

**ماموستای بەڕاستی سووژەی**

**ئەو مەسەلە کە چارەنووسی ئەم جووڵانەوە بەستە بە چارەنووسی یەک یا چەندکەسی دیاری کراوە هەڵەیەکی ئاشکرا و بەرچاوە.**

شیعروئەدەبی خۆی لە بەسەرهاتی راست ودروستی کوێرەوەری تێکۆشان،خاترجەمی ورحەت وسحەت هەلس وکەوت و چارەنووسی تاڵ و شیرینی ئەم خەڵکە وەرگرتووە و زۆر خۆی لەبەندی خەیاڵی پڕ و پووچی زەیندا نەبەستۆتەوە. بە کورتی ئەومەسەلەکەچارەنووسی ئەم جووڵانەوە بەستە بە چارەنووسی چەند کەسی دیاری کراوە هەڵەیەکی ئاشکرا و بەرچاوە.

وەفاتی لەپڕی ماموستا هێمنی رەحمەتی لە هەل و مەرجێکدا بوو کە باری هەرە قورس لەسەرشانی ئەو پیرە بوو. بەلام هەروەک خۆی تێبینی لەسەر بوو و هەموو بەچاوی خۆمان دیتمان پاش مەرگی ئەو نە تەنیا کارەکان مەحتەل نەبوون وسروە نەکەوت بەڵکوو هەستی پاک و پشتیوانیّ هەموولایەنەی خەڵکی وەفادار بەم شۆڕشە رەسەنە فەرهەنگی یە هانی داین لە هەوەڵین ژمارەی "سروەی بێ ماموستا"دا سەرەڕای بەرنەدانی رێگەی پێشوو بەزیاد کردنی "ویژەنامە" لەخزمەتکارێکی بەراستی کە گیانی لەرێگەی خزمەت بەخەڵک ونیشتمان و ئامانجەکەی بەخت کرد رێز بگیرێ ودیسان "سروە" درێژەی درایە.

**ئێستا بەفەزڵی خوای مەزن وبە هیممەتی هۆگران ولایەنگرانی،"سروە" لە هەموو شەقام وکووچە و کۆڵان وبنکەیەکدا بنەگر بووە ولەجاران جوانتر چلچرای مێژووی تاریکان و رەشایی یەوخوریدۆڵ ودەرەی ، ساردی هەرێمی دوورەدەستە. ئیمرۆ باسی سروە شەوچەرەی هەر کۆڕوکۆبوونەوەیەکی** فەرهەنگی لە دەرو ژووری ولاتە

بەراستی ئەرکی پاراستنی دەستکەوتەکانی ئەم شۆڕشە پڕشکۆیە گرانە.ج بارێکی قورسە کۆڵەوباری چاوەڕوانی مێژوو! بەراستی زایەڵەی زەنگی کاروانی تەنیایی و خەیالاوی بڕست وبڕشتی ئەم بارەی نیە ولە سەرشانی هەموانە وبەبێ جۆش وخرۆشی هەموان پێک نایە.

" خوایە بۆخۆت بیپارێزی"

**ئێستا بەفەزلی خوای مەزن و بە هیممەتی هۆگران ولایەنگرانی "سروە"لە هەموو شەقامو کووچەوکۆڵان وبنکەیەکدا بنەگر بووە ولەجاران جوانتر چلچرای مێژووی تاریکان ورەشایی یەوخۆری دۆڵ ودەرەی ساردی هەرێمی دوورەدەستە. ئیمڕۆ باسی سروە شەوچەرەی هەر کۆڕو کۆبوونەوەیەکی فەرهەنگی یە لەدەر و ژووری ولات.**

بسمه‌تعالی

# سرمقاله

سخنی با خوانندگان عزیز

با سلام وآرزوی توفیق برای یکایک شما، همانطور که میدانید با انتشار این شماره،"سروه" میرود تا دومین سال حیات خود راپشت سر گذارد. دوسالی که تلاش رنج ومبارزه با مشکلات لحظه لحظه‌اش را به هم پیوند میداد. دوسالی که قلمها سخت مشغول بودند تا بلکه گوشه‌ای از محرومیت تاریخی این مردم را جبران نمایند. دوسالی که سراسر شور بود وغوغا، امید بود و انگیزه برای شکستن طلسم عفریت ستم وجشن گسستن زنجیر فرسوده اسارت ازپای مردمانی که مظلومیت ومحرومیتشان

بروانە لاپەڕەی ۷۶

# بێگانە پەرستی

«ماموستا هەژار»

... حائێمەی کوردی ماڵ وێران بەناشکوری خودا نەبێ، ئەگەر وەک گەلانی دیکەی خودا پێداو، تا ئێستا بۆمان نەلواوە بەزمانی خۆمان بخوێنین وخوێندەوارەکوردە زاناوتێگەیوەکان، بەزمانی کوردی بنووسن وئەزموونی گەلانی ترمان بەکوردی تێ بگەیەنن وکتێبخانەی خۆماڵیمان، زۆرئاوەدان و قەوغابێ. دیسان نابێ لامان وابێ بەتەواوی بەش براوین. گەلێک پەندوئامۆژگاری نرخداری کەونارامان، بە میرات بۆماوەتەوە، دەماودەم فێریان کردووین و، نەفەوتاون ئەگەر بیانکەینە رێبەر و رێ شاندەرمان، کەمتر تووشی هەڵە دەبین و لە زۆر تەڵەی سەر رێگە خۆ دەرباز دەکەین. زۆرلە باپیرانی ژیرمان، ئەزموونی ژیانی خۆیان، بەچەند رستێکی لەشان سووک دەربریوە و، هەر یەکەی گەنجینەیەکن. پێویستە سەریان دەینەوەوبەهرەیان لێ هەڵکرێنین و، بیانکەینە ماموستای خۆمان. بۆ نموونە فەرموویانە:

**(هەرکەس بکا بێگانە ـ پەرستی، ئاخری هەر دەهێنێ نوشوستی.)**

بێگانە بەوکەسە دەڵێن: خەڵکی وڵاتی خۆت نبە، نامۆیەکی لاپرەسەنە، وە زمانێکی تر داخێوێ، خووی، ئاکاری ئیمانی، دەراوی زاری، دەگەڵ ئیمان ورەوشت ورەفتاری تۆ پێچەوانەن.

نەتیناسیوە، نایناسی. زاڵمە دەستدرێژکەرە. وڵاتەکەت داگیردەکا، دەیەوێ هاووڵاتی یانت، خزمانت، دەروجیرانت، بکاتە بەندە و کۆیلەی خۆی. بەروبووی وڵاتەکەی خۆت بەدەستی خۆت رەنێو بێنێ وبیبا بۆخۆی رەنجی ساڵی کوڕوکاڵی نیشتمانت بەرێتەوە وڵاتی خۆی. مایەی ژیانت تەنانەت زمانەکەشت لێ بەربەستکا و بەیەکجاری بێ هەستت کا....

ئەمجۆرە داگیرکەرانە ناویان لێ نراوە **ئیستیعمار**، کەبەراستی ژەهری مارن..... ئیستیعمار هەرئەوە نیە قژی زەردوچاوی شین بێ ولەرای دەریاوە هاتبێ. **هەر هێزێکی دەستدرێژکەر بۆسەر گەلێکی زەبوونتر ئیستیعمارە.** جابا چاوی وەک قیل رەش بێ وتووکی بە رەنگی خەڵووز بێ (مەسەلەن بەعسی وسەددامیش وئەوانەی وەکوو ئەو دەکەن ئیستیعمار ـ رن).

ئەوداگیرکەرە بێ فەرەی **لە وڵاتەکەی تۆ خەفتاوە، دەزانێ زۆر هاسان نیە**

**داگیری کا**. دەزانێ کە **دانیشتوانی وڵاتەکە بۆ پارێزگاری لە ماڵ و ناموس وگیانی خۆیان و کەس وکاروروماڵ وکاڵ و منالیان،** بەگژیدا دێن و دەیکووژن. ئەو مەسەلەشی بیستووە، گوتوویانە: **دەسکی بیور لە دار نەبێ دارناقەڵشێ .....**

دێنێ هەرلە خەڵکی نێوخۆی وڵاتەکە چەند کەسانێک بە پووڵ دەکڕێ و دەیانکاتە قوڵەچۆماغی دەستی خۆی وبەلاگەردانی بالای وبەگژ گەلی هاوخوێنی خۆیاندا دەکاو هەرلایەکیان بەکوشت بچن قازانجیەتی و دەبێتە مایەی سەرکەوتنی.

نەقڵی کابرای خۆی بە بێگانە دەفرۆشێ بەسەرهاتی کەوی راوە. کڕیارەکەی لە دان وئاو تێری دەکاو فێری دەکا: لە حەشارگەدا بخوێنێ و کەوەکانی هاورەگەزی بە دەنگی خۆیەوە بێنێ و دەنێو داوانیان هاڵقێنێ. بەلام تاکەی قەدر وحورمەتی دەمێنێ؟ تا کەوی لەوی چاتریان گیرناکەوێ، تاخۆی لەخوێندن ناکەوێ ولە کەو فریودان ناسرەوێ .... هەر رۆژێکی پەکی کەوت: کابرا بەگۆشتکەو فێرەکە، دەگەڵ چەند کەوێکی گیراو سەری دەبڕێ ولەسەر پلاوی دادەنێ. با نەڵێین کەو... بڵێین

تاژی، تاژی راوێ. قەلادەی ئاوریشمی خاوی پڕزەنگوڵەی لە ملدایە. راو بۆئاغای نامۆ دەکا. بە پڕتاو هات و چۆ دەکا. کەروێشکی سیخوار لەپشتی بەیەکەم هەڵپە بۆ دەگرێ. لەچەم مل ومۆی بۆ دەکا، پەلەوری بۆ وەکو دەکا، زۆر خۆشەویستە لای ئاغا، رێگەی دەدەن لە دەوروبەری وەتاغدا بحەپێ وراوێچکە بکا، بەرماو بخوا، هەمیشە تێروتەسەل و تەڕ و بەل بێ. شەوانە بۆحەسانەوە لەنێو قەلاغدا وەرکەوێ، جێی گەرم ونەرمی بەرکەوێ. سەگەلی گوند هەموو ئێرەیی پێ بەرن، نەوێرن لێشی بمرێنن یا پارووی لە دەم برفێنن. ئاخۆئەوخۆش رابواردنەی چەند دەمێنێ؟ ئەگەر پیر بوو، ئەگەرچڕنووک وپەنجەی سوان، ئەگەر گیرگەی لەکار کەوت، ئەگەر دەمگەرمی یەکەی نەما، چی بەسەر دێ؟.... کەس کاری بە تاژی یەک نیە هەر سەولەخۆری سل کەر بێ. خوێری دەکرێ، تاژی یەکی دەمگەرم وتازەلە شوێنەکەی ئەو دادەنرێ. ئەویش دەشێ بەپیری وبە زەمین گیری بقروسکێنێ وکەس بە ئێسکێک نەیلاوێنێ تا لە کەند وبوودڕێکدا بە ناهومێدی دەتۆپێ...

رەنگە ئێستە خوانەخواستە یاخوا داروبەرد گوێی کەڕبێ! ئەگەر کاوراییێ کوردزوان، لە کوردستاندا دەسکەوێ هەر چەند باوەڕ ناکەم هەبێ.. خۆی بە دوژمنی داگیرکەر واتا بەهێزی ئیستیعمار فرۆشتبێ، ئەم وتارەی من بژنەوێ، لە ئاوێنەیەک بنەوێ وتەرحی خۆی وەبەرچاو کەوێ، بە ئاوەزی من پێ بکەنێ وبزەیەک لێوی ببزێوێ ودەمی دڵی بورتێنێ: کە ئەم قسەقۆڕانە چین! خۆ من نە کەوم نە تاژیم، من زەلامم بەسوێلم زەمین دەکێلم، زیت و وریا و خاوەن فێلم، لە شوێن ژیانی خۆش وێلم. مایەی خۆشی

ژینم دەوێ ، چەک وئەسپ و زینم دەوێ .گەربۆ داگیرکەر کار نەکەم، باری لاری بۆ بار نەکەم،وەکوو خۆم گەڕەکمە ناژیم .ئێستا والە سایەی ئاغام خوا نەیبڕێ دەوروبەرم لێم دەترسێ ،کەس ناوێرێ لێم بپرسێ بۆ وادەکەم ! خواردن زۆرە، دراو کۆمە دنیاکە بە کەیفی خۆمە .

بەڵام ئەگەر ئەو کوردە نەجیمزادەیە! هەر تۆزێک بیربکاتەوە، ئاوڕ لە دوارۆژ داتەوە و خۆی تەواوبەسەرکاتەوە، رەنگە تێ بگا کە هەزار خۆزگەی بە تاژی .کەو یا تاژی دوو خانەوەری بێ بیرن ،راوکەر وبەراوگیراویش بیر لە تۆڵە ناکەنەوە و ئەوی ئەمرۆ بەسەریان دێ ،سبەی لەبیریان چۆتەوە. بنیادەم چی ؟ کێ خرایەی دەگەڵ بکا لە بیریەتی ... ئەگەر گەل وخزمفرۆش ئەمڕۆی دەستەڵاتی هەیە و ئازار و حەزرەبەی دەدا ، کینەی لە دڵدا هەڵدەگرێ تا ئەو هەلەی کە دەتوانێ تۆڵەی خۆی لێ بکاتەوە .

ئەوکابرا نەجیمزادەیەی کە دەبینێ بێگانە پشتی دەخورێنێ ودزی گەل وخزمانی خۆی دەکاردێنێ ،دەبێ ئەوەندە تێ بگا کە **قشقەڵە بەخۆڕایی پشتی نێرەکەر ناخورێنێ !** رۆژێک دەبێ قشقەڵەهەڵفڕێندرێ وپشتخورێنی گیر نەکەوێ ، یا گریمان هەڵنەفڕێنرا وتوانی خۆی سەقامگیر بکا وکەس نەمێنێ کشەی لێ بکا .بێگانەی وڵاتداگیرکەر چۆن دەبێ ئەوەندە کەربێ ، پووڵ و پارەو پارووی چەور بدا بە نێرەزەلامێک کە هیچ کاری پێ نەماوە !ئەگەر دار شەق و پەق کراوسووتێندرا ، هۆرە و کلکەتەور وتەشوێ فڕێ دەدرێو دەکار ناکرێ .ئەوجار ئەگەر زەلامی خۆفرۆش کەرە ، کاورای زەلام کڕ کەر نیە . **باش** دەزانێ ئەوکاورا خوێڕی و ناکەسەی کەسی خۆی بە پارەداوە ،هەررۆژێکی بێگانە- یەک بەکرێی بگرێ و پارەی زیاتری بداتێ ،دەیفرۆشێ و بەگژیدا دێ . بە دەردی "سەعدی" گوتەنی :**دامێن تەڕێک تەماح بکاتە دایکی خۆی ،چلۆن لە ژنی بێگانە دەپرینگێتەوە ؟!**

لەم بارەوە لە کتێبی المستظرف)دا چیرۆکێکی زۆر خۆش وپڕکاکڵ هەیە ،دەڵێ :

شاپووری شای ئێران گەمارۆی شارێکی دابوو (ناوی شارەکە حەزەرە ) ، دیواری شار لەوە بەرزوپتەوتر بوو بۆی بگیرێ .کیژی پاشای شاری دوژمن چاوی بە شاپوور کەوتبوو ،عاشقی ببوو .وڵامی نارد :

ئەگەر بەڵێنم پێ بدا کە دەمخوازێ وادەکەم ئەم شارە بگرێ .بەڵێن درا ، کیژ دەراوی هاتنە نێوی دەستنیشان کرد . لەشکر رژایە شارەوە ،باوکی کچی پاشای کوشت وخوێنی ئاپوورەی زۆر رشت وکیژەکەش بەمراد گەیشت وکەوتە نێوپەردەی بووکێنی .شاپوور هاتلەگەڵی بنوێ ،دیتی دۆشەک خوێناوی- یە . بووک لە وەرامی شاپووردا کە پرسی ئەو خوێنە چیە ؟ گوتی تاقانە و نازدار بووم ،دایک وباوکم بەشیرو هەنگوین و مێشک منیان پەروەردە کردووە .لەشم ئەوەندە ناسکە بەلاسکە گوڵ و ریحانەی نێو پێخەفەکەم زامار بووم .شاپوور بانگی لە جەلاب کرد :

وەرە سەری ئەم بێ ئەمەگەم بۆببڕە .باوک و دا کی ئاوایان بەخێو کردووە بە بێگانەی بەکوشت داون .سبەی رۆژێ چۆن ئەمەگی بۆمن دەبێ وبە کەڵەگایەکی دیکەم بەکوشت نادا ؟!

بەڵێ خوێنەری خۆشەویست باپیرانمان بەخۆڕایی نەیانگوتووە :

**"هەرکەس بکا بێگانەپەرستی ئاخری هەردەهێنێ نوشوستی "**

# قامووسی زمانی کوردی

دوکتور ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم

لەچەرخی بیستەمدا کە زمان وفەرهەنگی کورد بەپێی ئالٚ وگۆڕی کۆمەلاٚیەتی و مێژوویی گەشەی کردووە و بووژاوەتەوە ، ژمارەیەکی بەرچاو قامووسی جۆرا وجۆر بلاٚو کراونەوە. بەلاٚم لەبارەی زانستی قامووسی نووسیندا بەرهەمێکی ئەوتۆ بلاٚو نەبۆتەوە .

مێژووی فەرهەنگ نووسین بە زمانی کوردی دەگەڕێتەوە سالاٚنی (١٦٢٨– ١٦٨٣) پاش ئەمە **مۆریزیۆگا رزۆنی** لە سالٚی (١٧٨٧) دا لە پاشکۆی کتێبە رێزمانی یەکەیدا فەرهەنگێکی **ئیتالی – کوردی** بلاٚو کردۆتەوە .

بێجگە لەوانە ئەم فەرهەنگانەی ژێرەوەش بلاٚو بوونەوە :

**فەرهەنگی زانیاری** ، نووسینی مامۆستا عەبدولقادر بەرزەنجی .

**فەرهەنگی کشتوکالٚ** نووسینی مامۆستا مەعروف قەرەداغی .

**فەرهەنگی زانیاری** نووسینی مامۆستا کەمالٚ جەلال غەریب .

**ژمارەیەک زاراوەی جوغرافی** ، نووسینی مامۆستا غەفوور رەشید .

**فەرهەنگی زاراوەی پارێزگای سلێمانی** ، لە لایەن دەستەیەکەوە نووسراوە

لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد .

**هەندێک زاراوەی زانستی** نووسینی مامۆستا حەمالٚ نەبەز

دوابەدوای ئەمانەش چەند فەرهەنگێک بۆچاپ ئامادە کراون وەک :

**فەرهەنگی کوردی (سۆرانی) رووسی** کە بەشی کوردی دانشکەدەی رۆژهەلاٚتناسی لێنینگراد بە سەریەرستی ک .ک کوردۆیۆف ئامادەی کردووە .

**فەرهەنگی کوردی کۆڕی زانیاری کورد .**

**فەرهەنگی فریزیۆلۆژی** ( زاراوەناسین) زمانی کوردی نووسینی دوکتۆر ماکسیمی خەمۆ .

**فەرهەنگی کوردی – رووسی** ی .ئا ئۆربیلی کە لە دانیشکەدەی رۆژهەلاٚتناسی لێنینگراد بۆ لە چاپدان ئامادە دەکرێ .

ئەگەر بەوردی سەیری ئەو فەرهەنگانە بکەین دەبینین بەم جۆرە نووسراون :

**١– کوردی – کوردی**

**٢– کوردی – زمانی بێگانە**

**٣– کوردی – چەند زمانی بێگانە**

## ٤- زمانی بێگانە- کوردی

جگە لەمانەش فەرهەنگی زاراوە وەهی دیکەش زۆر نووسراون .

۱- **فەرهەنگی کوردی بەکوردی**

لەم ڕیزەدا **فەرهەنگی ماموستا شێخ محەمەدی خاڵ** - مان هەیە کە لەسێ بەرگدا نووسراوە . بەرگی یەکەمی ئەم فەرهەنگە ، سالی (۱۹٦۰) لە سلێمانی بلاو بۆتەوە . بەرگی دووهەم سالی (۱۹٦٤) وبەرگی سێ یەم سالی (۱۹۷٦) دیسان لە شاری سلێمانی دەرچوون . ئەم فەرهەنگە تەنیا فەرهەنگێکە کە بە یەکەمین فەرهەنگی تەواوی کورد دەژمێردرێ . هەروەها ماموستا جگەرخوێن دووبەرگی فەرهەنگی کوردی لە سالی (۱۹٦۲) دا بە ناوی **"فەرهەنگا کوردی"** لەچاپ داوە .

ماموستا گیوی موکریانی فەرهەنگێکی بۆچاپ ئامادە کردووە بەناوی **"بۆ کورد ستان"** . ماموستا ئاورەحمانی زەبیحی بەرگێکی لە**قاموسی کوردی** (ئەو واژانەی بە پیتی "ء" دەست پێدەکەن ) لە سالی (۱۹۷۷) دا لە بەغدا لەچاپ داوە بەرگی دووهەمی (ئەو واژانەی بە پیتی "ب" دەست پێدەکەن) لە سالی (۱۹۷۹) دا لەشاری بەغدا دەرچووە. حەمیدی ئیزەدپەنا فەرهەنگێکی بە ناوی **" فەرهەنگی لەک ولوڕ"** لە سالی (۱۹۷۸) دا لە بەغدا بەچاپ گەیاندووە .

۲و۳- **فەرهەنگی کوردی،زمانێکی بێگانە یا چەند زمانی بێگانە :**

لەم بارەوە چەند فەرهەنگێک هەن کە لەژێرەوە ، باسیان دەکەین :

* **فەرهەنگی کوردی ( کرمانجی ژوروو - زازا ) بە رووسی** نووسینی پیۆتر لێرخ لە ۱۰۸ لاپەرەدا .

* **فەرهەنگی کوردی بە فەرانسی** نووسینی ئا . ژابا کە پازدەهەزار واژەی تێدا کۆکردۆتەوە ئەم فەرهەنگە لە لایەن فردینا ندیوستی لە سالی (۱۸۷۹) دا بلاو بۆتەوە . هەر ئەونووسەرەفەرهەنگێکی - تری **کوردی بە فەرانسی و رووسی** داناوە کە هێشتا بلاو نەکراوەتەوە .

* س . ئا . ریا .

**فەرهەنگێکی کوردی -ئینگلیزی** وەک پاشکۆیەک بۆ کتێبە ڕێزمانی یەکەی خۆی نووسیوە .

* **فەرهەنگی کوردی ئەلمانی** نووسینی ئا. سۆ سین .

* **فەرهەنگی کوردی ،رووسی** نووسینی س . ئا یەگیزارۆ ف

* **فەرهەنگی کوردی عەرەبی** نووسینی یوسف زیائەدین پاشا ، خالیدی . لە ئەستەمۆل بلاو بۆتەوە .

* **فەرهەنگۆکی کوردی ئینگلیزی** نووسینی شاکر فەتاح ،سالی (۱۹۳٤) لە رەواندز بلاو بۆتەوە .

* **کۆلکە زێرینە کوردی فارسی - عەرەبی - فەرەنسی ئینگلیزی** نووسینی ماموستا گیوی موکریانی لە سالی (۱۹۰۰ )دا لەچاپدراوە . کە لە سالی (۱۹٦٦) دا دووبارە چاپکراوەتەوە .

* هەمان نووسەر فەرهەنگێکی تری لە سالی (۱۹٦۱) دا بلاو کردۆتەوە کە **کوردی - عەرەبی یە** ونزیکەی سی هەزار واژەی تێدا کۆ کراوەتەوە .

* **فەرهەنگی کوردی ،فارسی عەرەبی** نووسینی ماموستا شێخ محەممەدی مەردۆخ کورد - ستانی لە سالی (۱۹۰٦) دا لە تاران دەرچووە .

* **فەرهەنگی کوردی عەرەبی - فارسی** نووسینی ماموستا ع . سەجادی لە سالی (۱۹٦۲) دا لە بەغدا بلاو بۆتەوە .

* **فەرهەنگی کوردی - تورکی** نووسینی مووسا عەنتەر لە سالی ۱۹٦۷ دا بلاو بۆتەوە .

* **فەرهەنگی کوردی - رووسی** نووسینی ماموستا چ .خ . بەکایۆف سالی (۱۹۵۷) لە مۆسکۆ بلاو بۆتەوە .

* **فەرهەنگی کوردی - رووسی** نووسینی قەناتی کۆردۆ ساڵی (١٩٦٠) لە مۆسکۆ بڵاو بۆتەوە.

* **فەرهەنگێکی کوردی ئینگلیزی** وەک پاشکۆی کتێبێکی رێزمانی ساڵی (١٩٢٢) لە بەغدا چاپکراوە.

* **فەرهەنگی کوردی ئینگلیزی - فەڕانسی** نووسینی جۆیس بلۆ ساڵی (١٩٦٥) لە پاریس بڵاو کراوە.

* **فەرهەنگی کوردی ئینگلیزی** نووسینی مامۆستا تەوفیق وەهبی و س. گ. ئەدمۆندز، ساڵی (١٩٦٦) لە شاری لەندەن بەچاپگەیشتووە.

* **فەرهەنگی کوردی ئینگلیزی** نووسینی ئێرنیست ماکاریۆس لەساڵی (١٩٦٧) دا لە میشیگان چاپکراوە.

* فەرهەنگێک بە ناوی **"ئەستێرەگەشە"** کە **کوردی عەرەبی یە** لە ساڵی (١٩٧٧)دا لە لایەن فازیل نیزامەدین بڵاو کراوەتەوە.

**٤-فەرهەنگی زمانی بێگانە بە کوردی.**

* یەکەمین فەرهەنگ لەم رەدەیەدا فەرهەنگە **عەرەبی کوردی یەکەی** ئەحمەدی خانی شاعیری بەناوبانگی کوردە کە بە شیعر دایناوەوویستوویەتی منداڵانی کورد فێری زمانی عەرەبی بکا. تاریخی نووسینی ئەم فەرهەنگە دەگەڕێتەوە ساڵانی (١٦١٨تا ١٦٨٣)ی میلادی.

* **فەرهەنگی عەرەبی کوردی** بە ناوی **"ئەحمەدی"** نووسینی شێخ مارفی نۆدێ ساڵی (١٧٩٠) بڵاو کراوەتەوە.

**فەرهەنگی فەڕانسی رووسی - کوردی** نووسینی ئا. ژابا کە هێشتا بڵاو نەبۆتەوە.

* **فەرهەنگی رووسی - کوردی** نووسینی سی. ئا. یەگیزارۆف چوارهەزار وشەی تێدا بڵاو کراوەتەوە.

* **فەرهەنگی رووسی - کوردی** نووسینی دوکتۆر س. و فاریزۆف.

جگە لەم کۆمەڵە فەرهەنگانە وتار ونووسراوی بەنرخی دیکەش لە بارەی واژە و زاراوەی کوردیدا زۆر نووسراون بۆ نموونە دەتوانین باسی لیستەی ئەوزاراوە کۆمەڵایەتی وسیاسی یانە بکەین کە مامۆستا جەلادەت بەدرخان لە گۆواری "هاوار" دا بەناوی **فەرهەنگۆک** بڵاوی کردوونەوە.

* ی. ب. سوون لەساڵی (١٩١٣) دا لەپاشکۆی کتێبە رێزمانی یەکەی خۆیدا فەرهەنگۆکێکی **ئینگلیزی کوردی** نووسیوە و بڵاوی کردۆتەوە.

* هەر هەمان نووسەر لەساڵی (١٩١٩) دا فەرهەنگێکی **ئینگلیزی - کوردی** بڵاو کردۆتەوە.

* گیوی موکریانی فەرهەنگی **کۆلکەزێرینە**"ی بە **کوردی - فارسی - عەرەبی فەرانسی - ئینگلیزی** نووسیوە کەساڵی (١٩٦٦) لە هەولێر بۆجاری دووەم لەچاپدرایەوە

* **فەرهەنگی مەهاباد کوردی - عەرەبی** نووسینی گیوی موکریانی چاپی هەولێر (١٩٦١).

* فەرهەنگی **عەرەبی کوردی** گیوی موکریانی بەناوی **"رابەر"** ساڵی (١٩٥٠) لە هەولێر دەرچووە.

* **فەرهەنگی رووسی کوردی** نووسینی ش. ف نیکیتین ساڵی (١٩١٦) بڵاو بۆتەوە.

* فەرهەنگی **عەرەبی کوردی** بە شیعر بە ناوی **"دووڕشتە"** لەسەر **"نەوبەهاری"** ئەحمەدی خانی نووسینی مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس ساڵی (١٩٧٠) لە بەغدا بڵاو بۆتەوە.

* لە ماوەی ساڵەکانی (١٩٣٠ تا ١٩٣٣) دووفەرهەنگی **ئەرمەنی - کوردی** لە ئێرەوان بڵاو **بوونە**تەوە کە بەهەر دووکیان نزیکەی (٣٠٠) لاپەڕە دەبن.

* **فەرهەنگی ئەرمەنی کوردی** بە (٣٥٢)لاپەڕە و(٢٣) هەزار واژەوە ساڵی (١٩٥٧)

جا رێکی دەڵێن ژنــی فەقیــر ی
چۆ خزمەتی خا نمــی وەزیــر ی
پێی گوت شوودەکەم گەلێ فەقیــرە
پێویستی بە کۆمەگی وەزیــرە
کا رێکی موناسبی بــدا تــێ
بێچا رەیە زۆری خێر دەگا نــێ
چووپێی گوت وەیستی نا ردی هێنا ی
دی موستەحەقەکوتی لە رێی خوا ی
دەت نێرمە رەوەی بەنێوی بەیتا ر
مەخولێوە لەوانە جیدی بێکا ر
گیا زۆرتری خاوەنی خەوا ســن
گیا هەڵکەنەکا ن ئەوا ن دەنا ســن
لەوبەندەنە هەڵکەنە لە ما نــە
ویشکی کەوە بیخە نێو هەما نــە
هەرما ین و ئەسپێ دیت نەخۆشــە
وا سەی مەکەشین و رەش مەپۆشــە
نەختێ لەگیا کەتی بنــێ دەم
چا بووئەوەچا ک نەبوو جەحەنـدەم
دوا ی ما وەیەکی فەقیری تا یبــن
بۆنەبوو پزیشکی ئەسپ وما یــن
ئەمجا رەکە فیلی شا نەخۆش بــوو
شا خۆشی دەویست وەوی پەرۆش بوو
گوتیا ن لە رەوەی هەیە پزیشکێ
عەقڵی بە هەموو شتێکی دەشکێ

شا گووتی وەزیر بنێــرە با بــێ
دەرما نی بدا تێ بەڵکە چا بــێ
سوا رێکی هەنا ردوپیا دەیەک هــا ت
وێستا بووجەما ت و فیل و شا مــا ت
کا برا سەری لەو جەما تە سورمـــا
قەت فیلی نەدیبوو وا قی ورمـــا
دەم دا چەقی لووتی فش بووچا وزە ق
وەک خولخولە یەک لەدەوری مەزرە ق
سوورا و خولی دا نەشەش نەحەوجــار
ترسی هەبووبۆی بەرێ پەلامــار
شا پرسی ئەرێ وەزیر چ باســە
ئەودوکتورە بۆچی وا هەراســە؟
تێ فکرە قسەی وەزیری دا نــا
چ جوا ن و عەقڵ پەسنــدی دا نـا
لێی سوورە کە فیل هیلاکە قوربا ن
چا رەی نیە خۆی دەکا تە قوربا ن
شا رۆیەوە ژوورو ئــەهلی دەربا ر
رۆیشتن و ما ، وەزیرو بەیتــا ر
پێی گوت ئەرێ ئەی پزیشکی نا دا ن
پێم نەگوتی دەوا بە چا رەوا دا ن؟
ئیتر خول و سوورە کەت لەچی بو و
قوربا ن بە سەرت خەتا لە وی بو و
خۆمن قسە کا نی تۆم لە بیر بوو ن
بۆم لێک نەدەبۆوە لای سەروقوو ن
دەخولامەوە لای سەری پەیا کــە م
تا بیخەمە نا و دەمی گیا کــە م
هەندیلە سەرێکی ئەوسەری میــل
فەرقێکی نیە سەرو بنــی فیــل
پا شی وەکو سەردەچێ و سەری پــا ش
پێی پا نی بە عەینی لینگەبەردا ش
لەومەسئەلەدا هەما نە وێنــــە
ئەمما گەلێ مەسنەوی وەخوێنــە
گوێ هەڵخە لە کوێرەکا ن ببیســە
فیل کۆڵە کەیە و بەرەوگوریســە
تۆ ژیری لە خۆت مە کە قیا ســێ
زۆر کەس هەیە گا بە گون دەناســێ

«ماموّستا حەقیقی»

# ئیمە وباوەڕ

«مستەفا میرزی»

شتێکی بەڵماوە کە کردەوە وئاکاری هەر مرۆیەک لە بیروباوەڕی یەوە سەرچاوە دەگرێ .بیروباوەڕی مرۆ چ نێوەرۆکێکی هەبێ بەکردەوە نیشانی دەدا . جووڵانەوەی مرۆ بەپێچەوانەی بیروبڕوای خۆی وئاکارێکی کە باوەڕ پەسندی نەبێ شتێکی خراپە و دەتوانم بڵێم ناشگونجێ . هەر کۆڕوکۆمەڵێک وەبەرچار بگرین لە کۆمەڵی گوند و شارەوە بگرە تا وڵاتێک ،بگرە ئەندامانی چکۆلەترین بنکەی کۆمەڵ کە خێزانە ، بیرو باوەڕیان چۆن بێ ولەسەر چ بناغەیەک دامەزرابێ ، ئاکاروکردەوەیان هەروا دەبێ. بە تەعبیرێکی دی ئەقیدە و کردەوەی هەر ئینسانێک و هەر کۆمەڵێک پێوەندێکی نەپساو ولەپچڕان نەهاتوویان پێکەوە هەیە .

هەرکەس فامی کردبێتەوە وچاک وخراپ لێک هەڵاوێرێ و بزانێ باوەڕێکی هەیە ، ناتوانێ لەفەرمانی باوەڕی خۆی دەرچێ . بەو مەرجە باوەڕەکەی ساغ و تەواو بێ . دەنا فەرماندەرێک کە مەرجی فەرماندەری تێدا نەبێ ، فەرمانی بۆ بەڕێوە ناچێ و بە فەرماندەر ناناسرێ .

لێرەدا رەنگە خوێنەری ئازیز بپرسێ : ئەگەر ئەم قسە راستە بۆچی زۆرکەس بەپێچەوانەی مەرامی خۆی دەجووڵێتەوە ؟ بۆچی زۆرکەس کەخۆیان بە مسوڵمان دەزانن وبیروباوەڕی ئیسلامی یان هەیە ، زۆر کردەوەی واش دەکەن کە خراپەوئیسلام بە پەسندی نازانێ و مەنعی کردووە ؟

وەڵامی ئەو پرسیارەئەمەیە کە ناتوانین بڵێین ئەو مسوڵمانەی کارێکی غەیرە ئیسلامی دەکا بیروباوەڕی پتەوی هەیە یان ئەگەر هەشیبێ لەوکارە ناڕەوایەدا لەدەستی نادا . من بەپێی بۆچوونی خۆم لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام،پێموایە هەرکەس کارێکی ناڕەوا بکا و بشزانێ ناڕەوایەوئاینەکەی بەرگری لێ کردووە ، بێ گومان یا ئیمان وباوەڕی پتەونیە یا ئەگەر هەیبێ لەوکاتەدا لەدەستی دەدا وئیمانەکەی زەبوون وناتەواو دەبێ . یەکێک لە بەڵگەکانیشم لەسەر

ئەم بۆچوونەی خۆم ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەرە (د . خ) کە فەرموویەتی: " لایشرب الشارب حین یشربها وهومومن" یانی ئینسانی بە ئیمان ئارەق ناخواتەوە. ئەگەر بێتوو ئارەق بخواتەوە ئیمانی لە دەست دەدا. یان لانی کەم ئیمانی بەوە نامێنێ کەئارەق حەرامە چون بەرای هێندێک لە زانایانی ئیسلام، ئیمان یا باوەڕ، کەموزیاد دەبێ و هەرلە پلەیەکدا نامێنێتەوە. هێندێک لەبەڵگەی ئەو زانایانەش بریتی یەلە:

١- ئایەتی ژمارە (١٢٤) ی سوورەی - التوبە - کە دەفەرموێ "...و هەر کاتێک سوورەیەک دەهاتە خوار هێندێک لە دووڕوو (منافق) ـەکان دەیانگوت کێ لەئێوە ئیمانی بەم سوورەیە زۆر بووە؟ بەڵام ئەوانەی ئیمانیان هێنابوو بەهاتنی ئەو سوورە ئیمانیان زۆر دەبوو ومزگێنییان بەیەکتری دەدا." وەک دەبینین خودا لەبەرپەرچ دانەوەی قسەی دوو ڕووەکاندا کەبۆ گومڕا کردنی خەڵک دەیان کوت دەفەرموێ بەهاتنی ئەو سوورەیە ئیماندارەکان ئیمانیان زیاتر دەبوو.

٢- ئایەتی ٢ ی سوورەی "الانفال" کە دەفەرموێ: "مسوڵمانان کەسانێکن کە ئەگەر باسی خودایان لا کرا دڵیان دەترسێ وهەرکاتێش ئایەتی خودایان بەسەردا خوێندرایەوە ئیمانیان پێ زیاد دەبێ وپشت بەخودا دەبەستن" بەئاشکرا ئەمە بەڵگەیەکە بۆئەوەی کەئیمان زیاد دەبێ.

٣- سێهەم بەڵگەی ئەو زانایانە ئایەتی (٢٦٠) ی سوورەی (البقرە)یە کە دەفەرموێ "...ئەی محەمەد لە نێو یاراندا باسی ئەوکاتە بکە کە ئیبراهیم عەرزی خودای کرد: ئەی پەروەردگاری من پیشانم بدە چۆن مردووان زیندوو دەکەیەوە؟ خوداش فەرمووی: ئیمانت بەزیندوو کردنەوە نەهێناوە؟ ئیبراهیم فەرمووی: بەڵی ئیمانم هێناوە بەڵام دەمەوێ دڵم لەسەر ئەوئیمانە قایمتر و پتەوتربێ.

٤- بەڵگەی چوارەمی ئەو زانایانەحەدیسێکە کەحەزرەتی عومەر ریوایەتی کردووە و دەفەرموێ: "بەڵی تەنانەت ئیمان وازیاد دەکا هەتا خاوەنەکەی دەباتە نێو بەهەشتەوە. واش کەم دەکا هەتا خاوەنەکەی دەباتە نێوئاگری جەهەننەمەوە."

بۆ روونترکردنەوەی ئیمان من رام وایە کە ئیمان دوو قۆناغی هەیە. یەکەم قۆناغی ئیمان بریتی یە لە ناسینی شت. دووەم بریتی یە لەوەرگرتنی ئەوشتە بەدڵ. دەجا رەنگە ئینسان ئەوشتەی ئیمانی پێی هەیە بەباشی نەیناسێ یان ئەگەر بیشی ناسێ بەدڵ وەری نەگرێ کە دەبێتە زەبوونی ئیمان. هەروەها دەکرێ بە تەواوی بیناسێ وبەدڵیش وەری بگرێ، بەڵام لەبەر چەند هۆیەک رەنگە هێندێ جار لەدڵی خۆی دەری باوێ وبیخاتە پشتگوێ کە دەبێتە کەمبوونەوەی ئیمان.

دێینەوە سەرباسەکە و بەعیبارەتێکی دی دەڵێم ئاکارو کردەوەی هەرتاک و کۆمەڵێک پێوەندی توندی بەبیروباوەڕی ئەوتاک وکومەڵە و چەندەتی، و چۆنەتی ئەوبیروباوەڕەوە، هەیە. یانی ئەو باوەڕە لە باری چۆنەتی یەوە بەبێ لەبەرچاوگرتنی زۆروکەمی وتەواوونا تەواوی، ئەگەر باوەڕێکی باش بێ هەر کردەویەک لەو مەرامەوە سەرچاوە بگرێ بەکردەوەیەکی باش وپەسندکراو دەناسرێ و سوودی بۆتاک وکۆمەڵ دەبێ. ئەگەر باشیش نەبێ کردەوەکەش باش نیە وسوودی بۆ کەس نابێ. هەروەها ئەگەر لەباری

چۆنەتی (کیفیت)یەوە بیرو باوەڕێکی باشی بێ بەڵام لە باری چەندەتی (کمیت) یەوە ناتەواو بێ دیسان ئاکارێکی باش وبەرچاوی نابێ ئەگەریش ئەسەری چاکی هەبێ تەنیا بەپێی لێ هاتوویی وهێز و توانای خۆی ئەوتەئسیرە دادەنێ بەکورتی وبە کوردی کەم لە کەمی وزۆر لە زۆری.

دەتوانین بڵێین پێوەندی نێوان کردەوە وبیروباوەڕی، مرۆ وەکو پێوەندی فڕۆکە وفڕۆکەوان یا گەمی و گەمیوان دەچێ . ئەگەر فڕۆکەوان و گەمیوان بە باشی لەکاری خۆیاندا شارەزا بن ئەوە بێ ترس وهەڵە ڕێی خۆیان دەپێون وتووشی کەند و کۆسپیش نایەن .

هەڵبەت مەبەستم لەئیمان باوەڕە بەگشتی . جا چ باوەڕ بە خودا وژیانی دوای مردن و باوەڕ بە بنەڕەت وسەرچاوە ـ کانی مەزەب بێ ، چ باوەڕ بە راستی ودروستی هەر کار و کردەوەیەک یا هەر مەکتەب و مەرامو فکرێکی تر بێ .

بەهەر شێوەیەک بێ "باوەڕوئیمان" ئەسەری گرینگ لەسەر خاوەنەکەی دادەنێ .رۆحی هیواداری و فیداکاری ولەخۆبوردوویی ونەشکانی پێ دەبەخشێ . دڵخۆشی دەک وپەژارەودڵە کوتەی لێ دوور دەکاتەوە وبۆ بەربەرەکانی کۆسپ و گیروگرفت بەهێزی دەکا .

هەرچەند هەموو مەرامێک زۆر تەئسیر دەکاتە سەر خاوەنەکەی بەڵام باوەڕ و ئیمان ئەگەر "مەزهەبی" بێ ئەسەری زۆرتر وبەهیواتری هەیە .

لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا کە چۆن ئیمانی مەزهەبی تا ئەو رادەیە دەتوانێ ئارامی و بێ باکی وهیواداری بە ئادەمیزاد ببەخشێ ؟ (ویلیام جێمس) دەڵێ : ئارامی و راوەستاوی بەردەوامی بن دەریا قەت بە شەپۆل و تۆفانی سەرێی ناشڵەقێ." کەمەبەستی ئەوەیە ئینسانی خاوەن بڕوا هیچ شتێک کاری لێ ناکا وبەهیچ جۆرێک ئارامی وهیواداری خۆی لەدەست نادا .

باوەڕی مەزهەبی تەنیا لەسەر خوو وخدە و ئاکاری مرۆ ئەسەر دانانێ ، زۆر نەخۆشی هەن کە جگە لە ئیمانی مەزهەبی هیچ شتێک چارەسەریان ناکا .

دوکتۆر (کاڕل ژنک) لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی (مرۆی ئەمڕۆ بەشوێن خوادا ) دەنووسێ : لەماوەی سی ساڵی رابردوودا خەڵکی نەتەوە پێشکەوتووەکان سەریان لەمن هەڵێناوە وسەدان نەخۆشم لەوان چارەسەر کردووە .لەنێو هەموو نەخۆشەکانمدا کە لە تەمەنی سی وپێنج ساڵ بەرە و سەر دەژیان کەسێکم وەدەست نەکەوت کە نەخۆشی یەکەی بەهۆی لەدەستدانی ئیمانی مەزهەبی نەبێ . بە دڵنیایی یەوە دەتوانم بڵێم نەخۆشی رووحی هەموویان ئەوە بوو کە رێ و شوێنی ئاینەکانی خۆیان لەدەست دابوو .هیچ کام لەنەخۆشەکان هەتا مەرامێکی مەزهەبی یان قەبووڵ نەکرد چاک نەبوونەوە هەر بۆیە (ویلیام جێمس ) دەڵێ: "ئیمان لەو هێزانەیە کە مرۆی پێ دەژی و نەبوونی ئیمان بەمانای مەرگ و نەمانە ."

بەڵام با ئاورێک بدەینەوە سەرخۆمان وبزانین بڕوامان چیە وئەو بیروباوەڕە لەباری چۆنەتی وچەندەتی یەوە چۆنە . ئەگەر بیروبڕوایەکی تەواو و باشە بۆچی بەردەوام کاری دزێو وناڕەوا لەناو کۆمەڵەکەماندا روودەدا . کەم کاروکردەوەمان هەیە کە زیانی تاک وکۆمەڵی تێدا نەبێ .بۆچی کەسمان لە کەس رازی نیەوهیچمان لە هیچمان ئەمین نین وتەنانەت خوشک و براش کەمتر بڕوایان بە یەکترە ؟

بەهیچ حۆرێ لە زیان گەیاندن بەیەکتر راناوەستین درۆ ودەلەسەوبوختان بۆیەکتر هەڵدەبەستین . شەیتانی و دووزمانی یەکتر دەکەین. جنێووقسەی ناحەز بە یەک دەڵێین .ماڵی یەکتر دەدزین وداگیر دەکەین ، چاومان بریوەتە ماڵ وناموسی خەڵک وهەتا بۆمان بلوێ زیانیان پێ دەگەیەنین. بەدڵ دڵمان پێکەوە پاک نیە وئارەزوومان ئەوەیە کەس هیچی نەبێ و هەمووشتێک بۆخۆمان بێ . بەختەوەری یەکترمان بە دڵ پێ خۆش نیە . بەزیان وزەرەری یەکتر سەرودڵخۆشین .

سپاس بۆخودا کە لەنێو مسوڵمانان‌دا ئینسانی زۆر چاکیشمان هەن وئەرکی خۆ شیان بەباشی بەرێوە دەبەن . قسەکەی منیش نەبێتە غەیبەت وبوختان ولەباتی چاک کردنی کارەکە خراپتری بکەم! من مەبەستم هەموو کەس نیە بەڵکوو لەگەڵ زوربەی خەڵکمە و مەسەلەکە بەگشتی دەخەمە بەرچاو.

مەبەست ئەمەیە ، مادام ئێمە سەلماندوومانەوئاشکرایە کە چاکی وخراپی کردەوە و ئاکاری ئینسان پێوەندی بەچۆنەتی بیروباوەڕیەتی . لەلایەکی دیکەشەوە دەبینین کە ئێمەی مسوڵمان لەبەر چیە ئەو هەموو ئاکارە ناحەز و هەڵە وتاوانەمان لەنێو دایە. ئاکا بیروباوەڕەکەمان لە باری چۆنەتی یەوە بێ کەڵکە وبۆکاری خراپ وزیان هێنەر هانمان دەدا ؟ یان ئاکا لەباری چەندەتی یەوە ناتەواو وبێ هێزە وناتوانێ لەخوو خدە وداب ونەریت وفکر و کردەوەی خراپ لامان بدا و روومان بکاتە چاکە ؟

بێ گومان وەڵامی پرسیاری یەکەم "نا"یە . چون،سپاس بۆ خودا ئێمە مسوڵمانین وبیروبرومان ئیسلامی یە و ئیمانمان بەخوداوفەرموودەکانیەتی . ئیمان بەمانەش سەرەڕای ئەوە کە شتێکی تەبیعی وئاشکرایە ئەقڵ و زانستیش دەیسەلمێنێ . بۆ هەر کردەوە وئاکارێکی باش هانمان دەدا . رێگای چاک و خراپمان بۆ جیا دەکاتەوە .بۆ ئەوەی رێگای چاکە بگرینەبەر وسەربەرزی هەردوو دنیا وەدەست خۆمان بخەین، لە بەرانبەر کاری باشدا مزگێنی بەهەشتی پێ داوین . لەسەر کاری خراپیش، هەڕەشەی ئاگری جەهەننەمی لێ کردووین. بەڵام وەڵامی پرسیاری دووهەم (بەڵێ)یە . هیچ شک لەوەدا نیە کە ئیمانی ئێمە لەباری چەندەتی یەوە کەموکووڕی هەیە وهێندە بەهێز وپتەو نیە کەنەهێڵی شەیتان و هەوا و هەوەس ورەگەزپەرستی و خۆویستی لەرێ لامان بدەن و بمانخەنە چاڵی خیانەتەوە . هێندە بەهێز نیەبمان هێنێتە سەر رێگای راستکە سوود و قازانجی بۆتاک وکۆمەڵ تێدا بێ وهەردوولا لە ناتەبایی و ناکۆکی دوور بخاتەوە .

لێرەدا بەم نەتیجە گەیشتین ،خراپەی ئێمە لەوە سەرچاوە ناگرێ کە بیر و باوەڕمان پووچ و خراپە و ئەقڵ وزانست نایسەلمێنێ و بەشتێکی باشی دانانێ ، هی ئەوەیە کە ئیمان و ئەقیدەکەمان پتەو نیەو زۆر بەبڕوا نین . جا کە ئێمە دەردمان ناسی ودەرمانیشمان بۆ دوزی یەوە ، دەبێ بێ راوەستان ئەو دەرمانە دەکار بێنین ودەردەکان چارەسەر بکەین . مەبەست لەوەیە کە دەبێ هەوڵ بدەین ئیمان وباوەڕمان پتەوو قایمتر بکەین وبە لێهاتوویی مەسەلەکە شی بکەینەوە و ئیسباتی بکەین تا بزانین لە کوێوە هاتووین وئەرکمان چیە وبۆکوێ دەچین ؟

ڕۆژێک لەڕۆژان پیاوێکی پیروئیختیار ،چوو بۆ لای حەکیم وگوتی :

"زۆر ناسازوکەمتاقەتم ، پیاوی چابە عیلاجم بکە!".

حەکیم موعایەنەی کردوگوتی :

- دوێنێ شەو چت خواردووە؟.

گوتی : هیچ.

گوتی : ئەدی ئەم

بەیانی یە ؟

گوتی : هیچ .

حەکیم بۆی دەرکەوت کابرا جگە لە پیری وبێ تاقەتی هەژار وبرسیشە ولەوانەیە هەرئێستا بەلادابێ . زۆری زگ پێی سووتا . بۆئەوەی غەمباری نەکا ،گوتی :

- مامەگیان ! ئەم نەخۆشی یەی تۆ ،دەوادەرمان وپارێزی پێ ناوێ .بۆئەوەی چاک بیەوە ،هەرکارێکت پێ خۆش بوو بیکە ،ئێشتیات لەهەرچی بوو بیخۆ ، بە کەیفی خۆت رایبوێرە!".

کابرا گوتی :

- فەرمایشتەکەت راستە بەلام من ئیشتیام لەهەرچی بێ ناتوانم بە کەیفی خۆم لێی راکێشم ،چونکە شک نابەم. حەکیم کزەی لەجەرگ هات .چونکەپێی خۆش نەبوو بەم ئاخیری عومرە خەم و خەفەتی زۆرتر بکا ،گوتی :

- مەبەستی من ئەمەیە کە بیرلەم جۆرە شتانە نەکەیەوە وهەر چۆنێک بۆت دەکرێ ، دڵی خۆت خۆش بکەی ولەقەدەر حاڵ ،ئامانج وئاواتەکانت وەدی بێنی .

کابرا گوتی :

- خودا خێرت بنووسێ یارەبی راوەستاوبی ، چونکە منت ئاسوودە کرد . ئەڵبەتە خۆم دەزانم قەتئاواتم وەدی نایەن".

حەکیم گوتی :

- بەڵێ مامەگیان. وایە ئیشەڵڵا خودا شفات دەدا . ئێستاش کوێت پێ خۆشە بچۆ هیوادارم بەمراد بگەی".

کابرا گوتی :

- دەمەوێ بچمە سەیران".

حەکیم گوتی :

- زۆر چاکەبرۆ ئەسپاردەی خودابی".

پیرە رۆیشت .قسەکانی حەکیم زۆری کارلێ کرد .بەرەو دارستانی دەمرووبار کەوتە رێ .بە ئەسپایی دەڕۆیشت وسەیری دیمەنی جوانی بەهاری دەکرد. هێندێک پێچوو ،تەماشای کرد ئەوە دەرویشێکی زل وچوارشانە خەریکە دەستوچاوی دەشوا . چاوی بەپشت ملی پان ولووسی دەرویش کەوت ،لەدڵی خۆیدا گوتی :

- وەڵڵا بابە ئەمپشت ملە بابەتی ئیشە ،تەح.... چەند

لەبارە!"، لەوەدەمەدا قسەکانی حەکیمی وەبیر هاتنەوە کەدەیگوت :

"چت پێ خۆشە بیکە".

هەنگێ قۆڵی هەڵماڵی و بە ماتەمات چووە پێش وبە هەموو هێزی خۆی ئیشێکی لە پشت ملی دەرویش راکێشا ، پاشان دایە قاقای پێکەنین دەرویش بەزەحمەت خۆی پێ راگیرا ،تۆزێکی مابوودەچۆمە-

که بکەوێ .لێی راست بۆوە ، ویستی بیرازی بکا بەڵام تەماشای کرد زۆر پیرە .ئەگەر لووتی بگرێ لەوانەیە گیانی دەرچێ .لەبەر ئەمە توند دەستی مامەپیرەی گرت و گوراندی :

" بەدبەختی ماڵ وێرانا! لە گیانی خۆت بێزاری ئاوا دەکەی ؟ هیچ پێت عەیب نیە پێدەکەنی ؟ چما شێت بووی؟!

پیرە گوتی :

- وەڵڵاهی خۆشم نازانم بۆچی وام کرد ، لەخۆڕا ئێستام هەستا ،بەڵام پێکەنینەکەی ئەوەیە نازانم شەقەکەی ملی تۆ بووبای دەستی من ؟!".

ئەمەی گوت ودیسان دەستی کرد بە پێکەنین . دەروێش ئەوەندەی تر رقی هەستا وگوتی :

- ئێستا حاڵیت دەکەم!"

ئەوجا توند دەستی گرت و رایکێشا، بۆلای قازی .

دەروێش رووداوەکەی لە نووکەوە بۆقازی گێراوە و گوتی :

- جاقوربان ئەمە شکایەتی من، ئەمەش کابرای بێ شەرم .ئەگەر دەفەرمووی باتۆڵەی لێ بکەمەوە ، ئەگەر نا، بفەرموون چ بکەین ؟

-جەنابی قازی ! من بۆیە لێم نەدا ،گوتم دەستی لێدەدەم گیانی دەردەچێ ".

قازی چاوێکی لە کابرای پیرکرد ،زانی بەکاری تۆڵە نایە .ناعیلاج رووی لە دەروێش کردو گوتی :

- براگیان ،ئەم پیاوە زۆر پیرە ،بۆئەوە نابێ تۆڵەی لێ بکەیەوە . شتێکی لێ بێ بەسەرتدا ساغ دەبێتەوە ئەگەر هێزی لەبەردا بوایە هەقی خۆی بوو، بەرای من واباشترە لێی خۆش بی .

پێشینیان گوتوویانە :

" ئەو لەزەتەی لە بەخشیندایە ، لەتۆڵەئەستاندندا نیە" .

دەروێش گوتی :

بەخشینی چی ؟! جەنابی قازی ئەم حوکمە حەق نیە ، سۆزیخەڵک ئەمە ببیسن ئیتر کەس بە کەس نابێ . چاوی سپی ،ملی ماسێ! وەڵڵا

هەرگیز نایبەخشم!

قازی گوتی :

- هەر ئەوەیە گوتم ،ئەم کابرایە نەخۆش وپیرو پەک کەوتەیە ، هائێستا ،هاتاوێکی تر بەلادا بێ،باشتر ئەمەیە وازبێنی .

دەروێش گوتی :

- من دڵم بەمکارە رازی نیە .

قازی رووی‌لەپیرە کردوگوتی:

- چەندت پوول پێ یە؟"

پیرە گوتی : هیچ .

قازی گوتی :

- بەیانی چت خواردووە؟" .

پیرە گوتی : هیچ .

قازی رووی کردە دەروێش :

- ئەمکابرایە برسیشە شەپلاغەیەکی لێداوی خۆهیچت لێ کەم نەبۆتەوە .لێی گەڕێ وازی لێ بێنە . ئەی تۆ چەندت پوول پێ یە ؟.دەروێش گوتی : " شەش دینار".

قازی گوتی :

- زۆرچاکە ،نیوەی ئەم پوولەشی بدەیە ،لێی گەڕێ با بڕوا پارووەنانێک بخوا ، خودا خێرت دەنووسێ .

دەروێش زۆربە ناقایلی گوتی :

- چاک پێوە بووین !

بڕوانە لاپەڕەی ٣٣

گوندی "گۆشخانی" کەوتۆتە نێوان شاری سنەومەریوان . ( ۹۶) کیلۆمیتر لە سنە و (۴۵) کیلۆمیتر لە مەریوان دوورە .ئەم گوندە راستەوخۆ ناچێتەوە سەر رێگای ئەسڵی مەریوان وسنە . جادەیەکی (۳) کیلۆمیتری لە بەرانبەری "رەزاو" دەیخاتە سەر رێگاکە گۆشخانی سەربە ناحیەی "سەوڵ ئاوا"ی مەریوانە و لەلای راستەوە لەگەڵ"سەوڵ ئاوا" و"تەرخان ئاوا" ، لە لای جەنووبەوە لەگەڵ "رەزاو" و"کەڕئاوا" دراوسێ یە .

بە ئاماری "شووڕای ، ئیسلامی گۆشخانی" لە ساڵی ۱۳۶۴ی هەتاوی کۆچیدا ، ئەم دێ یە بریتی یە لە (۲۲۷)ماڵ و (۹۴۶) کەس .

گۆشخانی کەوتۆتە داوێنی کەژوکێوی بەرزی وەک "کوڕە ـ میانە" ،ئەم کێوانەش سەرچاوەی هێندێک کانین کە ئاوەکەیان بۆ دەوروبەری دێ یەکە دێتەخوار ویەک دەگرن ودەبن بە رووبارێک ، رووبارەکەش دەرژێتە نێو چۆمی رەزاو .

جووتیاری گۆشخانی بۆ داشتنی زەوی یەکانیان زۆریان جۆگە هەڵبەستووە . تەنانەت بەشێکی زۆر ئاوی گوندەکە بە جۆگە دەڕوا بۆ کەڕئاوا . خەڵکی رەزاویش ئاوی خواردنەوەیان بە بۆری (لوولە) لە کانی یەکانی گۆشخانی بۆخۆیان راکێشاوە . "هەوار"و"گوڵبەن"و"ئاغەگەورە" لە کانی یەکانی ئەم گوندەن. بەداخەوە لەبەر بچووک بوونی زەوی یەکان وکۆچ کردن بۆ شار ، کشت وکاڵی گۆشخانی بە برەو نیە .گۆشخانی هەمبەراوی هەیە هەم دێمە . گەنم ، جۆ تووتن ،شەوەر،پیاز ، نۆک سێوک (پەتاتە) ،.... لە گوندی گوشخانی رەنێو دێن .

گۆشخانی لەچاو دراوسێکانی دارودرەختی زۆرە . بەهاران دیمەنی بە شینکە وگیا و گوڵیرەنگاورەنگ دەڕازێتەوە وبەڕای خەڵکەکە لەگەڵ بەهەشت رقەبەری دەکا .هاژەی کانیاوان ،ورینگەی مەلان سروەی فێنکی بەهار ،گوڵی ئاڵ ووالا،دارودرەختی چڕوپڕ ،

میوەی جۆراوجۆر وبەلەزەت و سێبەری ماندووحەسێنەوەی ئەم راستی یە دەسەلمێنن .

زمانی خەڵکی ئەم گوندە کوردی گۆرانە ،ئەڵبەتە بن لەهجەی هەورامی زۆری کار تێکردووە . هۆی ئەمەش نزیکی وتێکەڵاوی دانیشتووانی لەگەڵ هەورامی یەکانە .

خەڵکی گۆشخانی هەموو واجیباتی ئیسلام بەجێ دێنن ودین بۆ هەموو کاروبارێکی ژین رێ پێشاندەریانە .مزگەوتێکی گەورەشیان هەیە کە سونەتی رابردووی هەرماوە . ئاوی بۆری یان هەیە کەچی بەئاوی حەوز دەسنوێژ هەڵدەگرن .گوندەکە کتێبخانەی نیە بەلام لە قەدیمەوە خەڵک وەدوو فێربوونی عیلم وزانستکەوتوون وزانای گەورەشیان لێ هەڵکەوتووە .ئێستاش خەڵک خوێندنیان بەلاوە زۆرگرینگە .

منداڵانی گۆشخانی تا سێهەمی راهنمایی لەوێ دەخوێنن ،بەداخەوە هێشتا دەبیرستانیان بۆدانەناوە .

لەچەند ساڵەی دواییدا ئاووبەرقیان بۆ کێشاوە و "بێهداشت"یشی لێ یە بەلام هێشتا وەکار نەکەوتووە .

خەڵکی گۆشخانی ماڵیان لە بەردوخشتسازکردووە . لەم دوایانەدا لەبەر ئەوە کە خشتهاسانتر دەستدەکەوێ و لە بەرد رێک وپێکترە زۆرتر لە خشتکەلک وەردەگرن . خانووی گۆشخانی وەک پلیکان بەسەر یەکەوەن. ئەویش چەند هۆی هەیە .

یەکەم: لەبەر ئەوە کە بە ئاتەگی شاخەوەیە .

دووهەم: خەڵکەکە بۆ پاراستنی گیان وماڵی خۆیان پاڵیان وێک داوە .

سێهەم: لەبەر هەندێک بەلاو مسیبەتی تەبیعەت وەکوو لافاو .

ئەم گوندە لە پێشدا لە شوێنێک بوو کە ئێستا پێی دەڵێن "گۆشخانی کۆن"وناوی هەریل ئاوا بوو .هەریل یا هەرای وشەیەکی هەورامی یە بەمانای جاو .خەڵکی ئەم گوندە قوماشێ جاویان لە لۆکە سازدەکرد .لەبەر ئەوە کاری خەڵکی ئەم گوندە بەرلەوە کە پارچەی جۆراوجۆر وتازە باو بێ ،جاوتەنین بوو ،گوندەکەشیان ناوە هەریل ئاوا .

ئەودەم کە دێ ودێهاتی ئێمە بە چنگ ئاغاوخانەکانەوە بوون ئەم گوندە ناوی"ئەحمەد سوڵتان" بووە . وەختێک میوان بۆ گوند دەهاتن خان نەیدەدیتن بۆیە دەستووری دا بیگوێزنەوە بۆ شوێنی ئەمرۆی گۆشخانی .

لەبەر ئەوەش کە لە قەلای خان زۆر نزیک بووە ناویان ناوە"گۆشخانی" ئەم وشەیەش هەورامی یە ولەراستیدا "گۆشۆخانی"یانی " شانی قەلای خان" .

لە گۆرستانی ئەم گوندە قەبری "خاتوون فاتمە" و "مەحموودبەگ"ی مەشهوور بە "ئاغاگەورە"ی لێ یە .خاتوون فاتمە ١٢٢ ساڵ و مەحموود بەگیش ١١٢ ساڵ لەمەوبەر مردوون .

نیە لە مومکینیٚ ئیمکان خدتا و سدهوی نەبیٚ
بە غەیری خاجەیی دیوانی (عالم الاسما)

لەم بەشەدا کە زۆریش سەرنجی خوێنەرانی بەڕێزی ڕاکێشاوە دوو مەبەستمان لەبەرچاوە: یەکەم: ئەوەی کە بە هاوکاری هەموو خوێنەرە بەئەمەگەکانمان هەڵەی ژمارەکانی رابردوو راست بکرێتەوە. دووەم: پێشنیاری خوێنەر بە هەموو ئەو کەسانەی کە بۆسروە دەنووسن یا دەیانەوێ بنووسن راگەیەندرێ. لە راستیدا ئەم لاپەڕە دەبێتە هۆی پەیوەندی گرتنی خوێنەرانی سروە و ئەو نووسەرانەی لە دوور و نزیکەوە شت بۆ سروە دەنووسن.

# ڕەخنە و

ژیان و شیعرەکانی قانیع بنووسن. لەبارەی حەجوزەکات و... لە کتێبی (فقه محمدی) مەقالە بنووسن.

ورمێ: **حوسێن ئەمیرحوسێنی**

لە گۆوارەکەدا ۴ پەڕە بۆ وەرزش زۆرە- هەروەها بۆچی لە سروەدا کتێبی باشمان پێ موعەرەفی ناکەن، عەکسی مامۆستا هێمنم بۆ بنێرن.

باختەران: **کاک سانا و**

لەچاپی کتێبی شامی کرماشانی - هەڵەی زۆری تێدایە ئەوانەی چاپیان کردووە ئاشنایییان دەگەڵ زمانی کرماشانی نەبووە.

بۆکان: **م.ع.ئازاد**

چیرۆکی شیردا بۆداپیردا لای ئێمە (بۆکان) برێک جیاوازی هەیە لەگەڵ نووسراوەکەی ئێوە.

محالی ئەنزەل: **کاک عەبدولقادر کوردی.**

جوابی هەر مەتەڵێک لە ژمارەیی دوایی دا بنووسنەوە و فەرهەنگۆک لە ئاخری گۆوارەکە پێویستە.

بۆکان: **کاک کەمال ئەحمەدی**

ئەگەر دەگونجێ لەسەر وەزنی شیعروقافیە مەقالە بنووسن. بەشی ئێمەوخوێنەر

**محەمەدی شانەزەری:**

۱- بابەتی شانۆگەری کوردی لەمچەند ژمارەیەدا بەرچاوم نەکەوتووە.

۲- بابەتی وەرگێران لە زمانەکانی دیکەوە (بابەتی باش و بەکەلک بۆ بەهێزتر کردنی گۆوارەکە).

۳- بابەتی مێژوویی کە پەیوەندی بە مەسەلەی کوردەوە هەبێ.

۴- کەم کردنەوەی بابەتی ئایینی، و زۆرکردنی مەتڵەبی زانستی وەکوو: رەوانشناسی، جامیعەشناسی، و داب و رەسمی گەلانیتر.

شنۆ: **کاک غەفوور سولیمی**

شوێنێکی تایبەت بۆ ئاساری باستانی و تاریخی کوردستان بکەنەوە.

شیراز: **کاک پێشڕەو سولەیمان**

ئەگەر گۆوارەکە ئەدەبی و فەرهەنگیە - ئیتر وەرزش

کاری بەوە چیە؟

سەقز: **کاک عەبدوڕەحمان گوڵستانی**

ئایا دەتوانن تاریخی وەدی هاتنی میللەتی کوردو رابردووی سیاسی بنووسنەوە، ئەگەر دەکرێ لەهەر ژمارەیەکدا باسی لێ بکرێ.

بۆکان: **کاک عەلی خوسرەوی**

تەرحەکان حاڵەتی تەبیعیان نیە و کاریکاتۆری تەواویش نین.

گرشیلانی مەهاباد: **کاک قادر رەحیمی**

باسی کۆمەڵایەتی بکەن و داب و رەسمی خراپ وەک ژن بە ژنە و شیربایی بەکاری دزێو و خراپ بەخەڵکی راگەیەنن. هەروەها باسی جێگاوشوێنی تاریخی کوردستان بکەن.

تاران: **کاک سەیدئەحمەدحوسێنی**

لە گۆوارەکەدا چیرۆکی درێژیش بڵاو بکەنەوە، لەسەر

بەختی ورد چاپ بکەن و چەند لاپەڕە بگرێتەوە.

**ڕەحیم قەڵاتی گەڵوانی**

بە بۆنەی وەرزی بەهارەوە عەکسی جوان ورەنگی لە گۆوارەکەدا چاپ بکەن. هەر وەها لەسەر وەزعی (اقتصادی) کوردستان مەقالەی باش بنووسن.

یەزد: **کاک مووسا محەممەد ڕەوانـدزی**

ئەگەر دەکرێ ژیاننامەی شاعیران و ئەدیبانی کوردستان بە گشتی بنووسرێ. فەرهەنگۆک لە ئاخری گۆوارەکەدا پێویستە بنووسرێ. ئەگەر بە باشی لە هەر ژمارەیەکدا چەند پرسیاری باش بنووسن تا خوێنەران بەدوایا بچن و ئەگەر جایزەشی بۆ دانێن زۆر چاکترە، ماوەی دەرچوونی مجەلەکە زۆرە. تکایە بیکەن بە مانگانە، جەدوەلەکەتان زۆر سەختە ـ سێخانەی جەدوەلی ژمارە چوار خاڵییە وبێ پرسیار. چۆنەتی ژیان و مەرگی مامۆستا هێمن بنووسنەوە و وێنەیەکم بۆ بنێرن.

مەهاباد: **کاک م.ک.**

. بەیتی لاس و خەزاڵ و شاعەبدولعەزیزی داسنی و... لە سروەدا زۆرتر چاپ بکەن. وێنەی شاعیرونووسەری کوردلە لاپەڕەی نێوەڕاستی سروەدا چاپ بکەن و ئوسلووبی شیعر و نووسینیان باس بکەن.

سەقز: **کاک حەسەن خانزادی**

١ـ نەبوونی هیچ چەشنە باسێک لەسەر شانۆ و شانۆ گەری لە گۆوارەکەدا.

٢ـ بەشێکلە دەسکەوتی ئەدەبیاتی هەندەران بەشێوەی وەرگێڕان.

٣ـ لاموایە ئەبێ چەند لاپەڕە بۆ لێکدانەوەی (نەقد) ئەو شیعروچیرۆکانەی کە چاپ دەکرێن تەرخان بکرێ.

سەقز: **کاک سادق عیرفانی**

بەدیتنی گۆواری سروە شاگەشکە بووم بەڵام وێنە کێشراوەکان وەک چیرۆک و بابەتە جوانەکانی گۆوارەکە یەک ناگرنەوە، تەرحەکان زۆر ئاسانن و شارەزایی خۆی تێدا نانوێنن.

**کاک سەیدجەمال شوکری:**

١. پێشنیارم ئەوەیە لەبارەی تاریخی و مێژووی کوردی زیاتر بدوێن. لەسەرباسی ئاسنگەری بدوێن.

٢ـ ماوەی دەرچوونی کەم کەنەوە "ئی گۆواری سروە".

بۆکان: **کاک حامیدئەحمەدی**

١ـ چەند لاپەڕەیەکی گۆوارەکە تەرخان بکەن بۆ ڕەخنەی خوێنەران.

٢ـ چەن لاپەڕەیەک بە لاوانی تازەپێگەیشتوو بدرێ.

٣ـ بەڕێزان وەک مستەفا بەگ) هۆنراوەکەیان لە گۆشەیەکدا چاپ بکرێ.

باختەران: **کاک محەمەد ڕەوانسەری**

١ـ گۆواری سروە بکەنە مانگانە.

٢ـ چەند لاپەڕێک فرەتر بەشیعر و پەخشان تایبەت بدەن.

٣ـ باسی جوغرافیای کوردستان ـ جێژنی مەولوود باسی ژیانی سەلاحەدینی ئەیووبی پێوەندێکی بە گۆواری سروەوە نیە.

بانە: **کاک تاهیریوسفی**

باوەش کردنەوەی لاپەڕەکانی سروە بۆ گشت بابەتێکی زانستی وەک مێژوو فەلسەفە و بابەتەکانی دی ڕێگایەکە بۆ گەیشتنی سروە بە گۆوارە بەنرخەکانی سەردەم.

هەمەدان: **کاک جەعفەرقادری**

مانای وشەکان لێبدەنەوە وێنەی قەدیمی یا نەخشەی کوردستان چاپ بکەن.

سەقز: **کاک عەلی ئەمیری**

لەبارەی جوغرافیای سەقز لە گۆواری ژمارە١ـ٢ـ٣ـ٤ـ بە داخەوە لە قەڵای قەدیمی کلێپە کە من خەڵکی وێم، کانیەکی لێیە بەناوی کانی" قەڵعە" و کانیەکی دیکەی لێیە بەناوی "کانیەکۆرە" و قەڵایەکە

خەراپبووە کە لە ئاساری سەقز تاران نیشانە گوزاری بۆ کراوە،تکایە لە گۆواری سروەدا بینووسن.

**سنە :جەلیلی پوورشاد :**

١- باسی شەڕی قارەمانەتی کوردەکان هەروەک دەوری عوسمانی٢٠- قەلای دمدم ...مان بۆبنووسن * لەبارەی ئاساری مێژوویی کوردستانەوەبدوێن * ئەگەرئێمکانی هەیە سروەبکەنە مانگانە * جەدوەلەکان زیاد بکەن * تۆزێ لە ژیانی گەورەکانی کورد بدوێن * رێنوێنیم بکەن چۆن شیعر بلێم * شیعروچیرۆکم زۆرهەیە بلێن تا بۆتانی بنێرم.

**تەکاب :رەسوولیخزرزادە-تەها مامەبایزیدی - کاکانی**

ئەگەر دەکرێ سەبارەت بە رەسمی ناپەسەندوناحەزی وەک ژن بەژنە بدوێن.

**ناوچەی مەریوان: رەحیم مەعرووفی**

١- باسێکی تایبەتی بۆ مافی ژنان لە بەرانبەری پیاواندا چون من پێم وایەلە کوردستاندا پیاوان نەتەنیا هیچ رێزوئیحترامێ بۆ ژنان دانانێن بەڵکوو وادەزانن ئەگەر ئیحترامیان لێبگرن سووک دەبن * باسێک لەبارەی چۆنەتی پەروەردەکردنی منالانی ساواوشێوەی هەڵسە و دانیشتن لەگەڵ ئەواندا بۆ ئەوەی بەباشی تەربیەت بکرێن ئەگەر ویستتان دەتوانم لەم بارەوە هاوکاریتان بکەم.

ئەگەر دوولاپەڕەتان تایبەت دا بە ژنان باسێکی لەسەر چۆن دروستکردنی چێشت و بایەخی ئەو شتانەی وا تێی دەکرێ بنووسن * بۆچی لە گۆوارەکەدا ناوی شاعیری بەناوبانگ مامۆستا قانیع نابرێ؟ * پرسیار :"دەکەم، دروستە یائەکەم".سوپاس هەڵەیە یا سپاس."سۆما"یانی چی؟

**بۆکان: سەعادەتی یووسفی**

سروە بکەنە مانگانە .وێنە و نەققاشییەکانی سروە رەنگی بن * لاپەڕەکانی شیعروژمارە تەنزەکان زۆرتربن * لەهەر ژمارەیەکدا داب و شوێنی زەماوەندی ناوچەیەکی کوردستان بەوێنەوە چاپ بکەن * چەند کورتەچیرۆک و چەند پارچە شیعر و مەتەڵم هەیە ئەگەر قەبووڵی بکەن بە دیاری بۆتانی دەنێرم چاپی بکەن.

**بۆکان :مستەفانیعمەتی**

بۆ سروە بەوەختێکی مشەخەس بڵاو ناکرێتەوە؟،ئەگەر لەباری مالییەوە کەمایەسیتان هەیە پێموایە لایەنگر و خوێنەری سروە یارمەتیتان دەدەن * لەهجەوشێوەزمانی سروە وەک کامیەک لە لەهجەکانی کوردیە؟ئایا تەواوی خەڵکی کوردستان لێ حاڵی دەبن و کەلکی لێ وەردەگرن؟ ئایا لەهجەیەکی سەرانسەری

# رەخنە و

کە تەواوی کوردستان لێیحاڵی بن هەیە ئەگەر هەیە بۆچی کەلکی لێ وەرناگرن * چەند کەلیمە و جملەمان خوێندەوە کە پێموایە خەڵکی لای سنە و دەوروبەر لێی حاڵی نابن وەکوو کەلیمەی"لەکن" "لەمێژ" و کەلیمەی دی * من پێموایە ئەو وشانەی ریشەی فارسی و عەرەبییان نیە لەهەر لەهجە - یەکدایە بەنێوی کوردی کەلکی لێوەرگرن * سروەبکەنە مانگانە.

**سەقز :کاک عەلی سەلامی**

لە لاپەڕەی ٤١ی سروەی ژمارە چوار کاک سەلاحی عەرەبی لە (پیرەداردا) نووسیویەتی :بەهارهات و هاوین رۆیی ،بەنەزەری من کە بەهار بێت وەرز خۆش دەبێ، بەڵام ئەم نووسیوەتی(سەرما گەرایەوە) دوای ئەوە زستان پێش بەهارە نەوەک هاوین.

تێبینی: من ئامادەم کە هەرشتێکی بەنرخم دەسکەوێ بۆتانی بنێرم ،بۆ ئەوەی ئێوە بڵاوی بکەنەوە.

**خانێ : ئەبووبەکرئەحمەدی**

لەبارەی مەسایلی فەرهەنگی،ئەدەبی،مێژوویی ، فۆلکلۆری و ...ناوچە جۆربە

جۆرەکانی کوردستان شت بنووسن و لێکۆڵینەوە بکرێ * چەند لاپەڕەیەک تەرخان بکرێ بە مەسایل و چیرۆک و شیعر و پەخشان و... بۆ منداڵان و نەوجەوانان * ئەگەروێنەکان و سەردێڕەکان رەنگی چاپ بکرێن دیمەنێکی جوانتر دەدەن بە گۆوارەکە وئەگەر بەو پێیە قیمەتیش زیاد بکرێ گرینگ نیە * گۆواری سروە بکرێتە مانگانە.

شنۆ: **محەمەدعەرەب**

بۆچی شاعیر و نووسەری بەڕێز مامۆستا هەژار ج نووسراوەیەکی لە سروەدا بەچاپ نەگەیشتووە؟

محاڵی سۆمای برادۆست: **مەلا محەمەدی عومەری**

بەداخەوە گۆواری سروە زۆری وشەی فارسی وعەرەبی تێدایە و کوردی جۆتە دەر.

شنۆ.گوندی نەلۆس: **غەفوور سەلیمی**

بەشیک تەرخان بکرێ بۆ شوێنە باستانیەکان یانی ئەو جێگایانەی شوێنی‌تایبەتی تاریخی و مەڵبەندی‌کوردستانن باسیان بکرێ.

بۆکان: **فەتتاحی شەریفی**

بۆچی مامۆستاهەژار شیعری شینی بۆ مامۆستاهێمن نەگوتووە؟

سەردروود: **عوسمانی قادری رێبوار**

ئایا زمانی یەکگرتوو تەنیا بۆ کوردستانی ئێرانە؟ لە ژمارە ٣دا نووسراوە کتێب و بەرهەمی ئەدەبی و زانستی بەهەر لەهجەیەک زیاتر نووسرابێ،دەتوانێ ببێتە هۆی پێک هاتنی زمانی کوردی" جاکە وایەکوردستانی عێراق لەمێژە خەریکی کوردی نووسینن.

سەقز :**توفیقی قاسمی**

بە یاسای ئیسلام وئیمامی شافیعی لەبارەی زۆر مەسایلەوە بۆ لاوانمان شت بنووسن * سروە بکرێتە مانگانە یا ماوەکەی کەمتر بکرێتەوە * لەبارەی مێژووی کوردستان پێش ئیسلام فەرهەنگ و ئەدەبی کورد لە رابردوودا و شوێنە تاریخیەکانمان.

بۆکان:**کاک مستەفا ئیسماعیل ـ پوور**

ئایا ئینتیشاراتی سەلاحەدینی ئەیووبی دەیەوێ دیوانی مامۆستا هەژار و دیوانی تاریک وروون ونالەی جودائی مامۆستاهێمن لەچاپ داتەوە یان نا؟

**شێرکۆناکام:**

مامۆستاهێمن جگە لەتاریک، وروون و نالەی‌جودایی و هەواری خالی و پاشەرۆک و چەندوتار کە لە سروەدا چاپ کراوە شوێنەواری تری بەجێ هێشت یا نا؟ رشتەی‌مرواری نووسەرەکەی کێیە و لەبارەی چ دایە؟ ئایا وەگیر دەکەوێ؟ ئایا بەرگی دووەمی"مێژووی ئەدەبی کورد" لەچاپدراوە؟ لەبارەی مۆسیقای کوردی و گۆرانی بێژە بەناوبانگەکان بنووسن.

محاڵی ئەنزەل:**عەبدولقادر کوردی**

جوابی هەر مەتەڵێک لە ژمارەی دوایی‌دابنووسنەوە لە چیرۆک بۆ منداڵان،منداڵ کەمتر تێدەگا ،دەبێ چیرۆکەکە وابێ لەگەڵ تەبعی منداڵ یەک بگرێتەوە ـ و نەتیجەی باش بەدەستەوە بدا ، چیرۆکی پاڵەوان فس فس هیچی موسبەتی تێدا نیە .

دانانی فەرهەنگۆک لە ئاخری هەر ژمارەیەکدا ، بۆ لێک دانەوەی هەندێ وشەی سەخت ، پێویستە ، هەرکەس دوو یا سێ جار جەدوەل بەتەواوی و دروستی پڕ بکاتەوە جایزەی چیە؟

کاژێی سەردەشت :**کاک سەعید رەحمانی**

رەخنە لەسەر باسی"خەرمان پێوان" ئێوە تا ٢٠تەنەکەتان پێواوە و تەنەکەیەکتان زەکات دەرکردووە بەڵام شەرعی ئیسلام دوو تەنەکەیە ـ ئەلف وبێی کوردی لە ژمارەیەکدا بنووسنەوە و فەرهەنگۆک لە ئاخری گۆوارەکە **پێویستە .**

«« زانایانی بەناوبانگی کورد »»

# عەبدوڵڵا ناهید (افتخار)

خوالێ خۆشبوو عەبدوڵڵا ناهید (ئیفتیخار) زانایەکی گەورەی کوردە کە ساڵی ١٢٧٠ی هەتاوی لەشاری سەقز لەدایک بوو و ساڵی ١٣٢٤ی هەتاوی لەگوندی سلێمانکەندی سەقز کۆچی دوایی کرد.

پێش ئەوەی ژیان وبەسەرهاتی ئەم زانا هونەرمەندە بخەینە بەرباس ولێکۆڵینەوە پێویستە ئاوڕێک وەسەر عێلی فەیزوڵڵا بەگی بدەینەوە و شێوەی ژیان وبەڕێ چوون وهەڵسوور داسووری ژیانیان هێندێک بخەینە بەرچاو.

ئەم عێلە کە بەگزادەشیان پێدەڵێن و عەبدوڵڵا ناهید لەبەرەیەکی ئەوان کەوتۆتەوە عەشیرەتێکی کۆن و لە مێژینە ورەسەنی کوردە. پیاوی گەورە وهونەرمەندیان لێ هەڵکەوتووە. پیاوی ئەم عەشیرەتە نموونەی بوێری و ئازایەتی بوون وعەشیرەتەکانی دەوروبەریان نەیانوێراوە تێیان ڕۆبێن. لەگەڵ ئەوەش کە سوارچاک و ئەنگێوە وکوڕی مەیدان بوون لەباری هونەرو پلەی سەوادوزانست وشارەزاییو شارستانەتی یەوە زۆر سەرکەوتوو بوون. هۆی ئەم پێشکەوتنە ئەوەیە کەناوچەی فەیزوڵڵا بەگی کەوتۆتە دەشتایی وقەراغ شاروسەر ڕێگای شۆسە وجادە و بەئاسانی دەتوانن خۆ بگەیەننە ناوەندی پێشکەوتن وبارهێنان.

لەو سەردەمەدا زوربەی عێلاتی کوردەواری کۆچەر بوون وبەدووی مێگەل ورەوەی ئاژەڵدا گەرمێن وکوێستانیان دەکرد. رەعەمەل هێنانی مەڕومالّ وبڕینی چڕو ئەستەمی چیاکان وەختێکی بۆئەوان نەدەهێشتەوە تاکوو نووسین وخوێندن فێربن وپلەی زانست وهونەریان بەرز بکەنەوە. بەپێچەوانەی ئەم عێلانە عێلی فەیزوڵڵا بەگی کۆچەر نەبوون وژیانیان بەکشت وکاڵ وبازرگانی وکارکردن لەئیداراتی دەوڵەتی رابواردووە. دێهاتی فەیزوڵڵابەگی زۆر ئاوەدان وبەپیت وبەرەکەت بوون وهەموو گوندەکان مزگەوت ومەلا ومەدرەسە وتەنانەت حەمامیشیان بووە. فەیزوڵڵابەگ سەرۆکی ئەم عێلە پێش ئەوە گوندێک دروست بکا دەستووری داوە مزگەوت وئاوو حەمام دروست بکەن. بەمجۆرە ئەم بنکە ئینسانی یانەی لە ناوچەدا دامەزران هەرلە سەرەتاوە دەستیان بەخوێندن وتێگەیشتن وفێربوون راگەیشتووە.

ناوچەی فەیزوڵڵابەگی کەوتۆتە رۆژهەڵاتی بۆکان وجەنووبی رۆژهەڵاتی سەقز کە وڵاتێکی بەپیت وبەرەکەتە وبەتایبەتی بۆگەنم وجۆ لە هەموو کوردستاندا شازە. ئەم هۆیانە هەروەک گوتمان بوونە هۆی پێک هاتنی هۆز و عێلێکی پێشکەوتووی خاوەن فەرهەنگ و هونەر کە لە کوردستاندا ناوبانگیان دەرکردووە.

عەبدوڵڵا ناهید لە بەسەرهاتی خۆیدا دەنووسێ:

"ناوم عەبدوڵڵا وناوی بنەماڵەم ناهیدە. کوردم وبنەچەکەم ئاریایی یە. باب وباپیرم هەمیشە لە کوردستان ژیاون. باوکم مستەفا خان (سالار ناسر) کوڕی شێربەگە وئەویش کوڕی فەیزوڵڵابەگە. باوکم بۆ ئاوەدان کردنەوەی گوندی سلێمانکەندی زۆر تێکۆشا و مزگەوت ومەدرەسە وحەمام وکارگەی تەونی لێ

دروستکرد وبەباغی جوان و سەرسەوزییش دەوروبەری رازاندەوە .مەدرەسەی سلێمانکەندی زۆربەناوبانگ بوو. ماموستا مەلا رەحمانی کۆیی کە لە عیلمی "مەعقوول ومەنقوول" دا وەک دەریا بوو لەم مەدرەسەدا دەرسی دەگوتەوە .

شاعیرێکی خۆش قەریحە وئەدیبێکی بێ وێنە بوو.زانا وشاعیر وفەقێ ومەلا لە سەرانسەری کوردستانەوە بۆ فەیزوەرگرتن دەهاتنە خزمەتی ."

عەبدوڵلا ناهید پاش خوێندنێکی سەرەتایی لە سلێمانکەندی وسەقز ومەهاباد دەڕواتە تەورێز وپاش بەینێک دەیەوێ بۆفێربوونی زانستی خۆی بڕواتە ئورووپا. بەڵام بەهۆی دژایەتی خزموکەس وکاری ، ئەم کارەی بۆ ناچێتەسەر وزۆریشی پێناچێ شەڕی یەکەمی جیهانی دەستپێدەکا وبڵێسەی ئاگری شەڕ هەموو گۆشەوکەنارێکی ولات بەتایبەتی کوردستانی ئێران دادەگرێ .کوردستان دەبێتە مەیدانی شەڕی رووس وعوسمانی وزەرەوزیانێکی زۆری وێ دەکەوێ .هێندێ کەس کە لایەنگری لە عوسمانی یەکان دەکەن بەدەست رووسەکان قەلاچۆ دەکرێن .لە مەهاباد وئیندرقاشدا هەشت هەزار کەس بەوتاوانە قەتڵ وعام کران و زۆر کەسی دیکەش وەک شێخ بابا وعەلیخانی سەردار بە تاوانی لایەنگری لە رووسیای تەزاری ئیعدام کران .ناهید لەمەودوا دەکەوێتە گێرەوقەرقەشی رۆژگار وبۆ نەجاتی خەڵکی ناوچەی سەقز وبانە و دووپات نەبوونەوەی کوشتاری دڵتەزێنی مەهاباد و ناوچەی شارویران هەوڵ دەدا . زۆرجار لەلایەن خەڵک وحکوومەتەوە دەبێتە حاکمی شارستانی سەقزولە هەل ومەرجی پڕمەترسی ئەوکاتەدا خزمەتێکی زۆر بەخەڵک دەکا و نایەڵێ داگیرکەرانی رووس وعوسمانی خەڵکی ناوچە قەتڵ وعام بکەن .ئەم هەڵسووران وهەدا نەدانە ، ناهید دەکاتە خۆشەویستی خەڵک و ماڵی دەبێتە رووگەی لێقەوماوان وگرفتارانی ناوچە .هەر ئەو خۆشەویستی یەشپاش شەڕی جیهانی بووبە هۆی هەڵبژێرانی بۆ پاڕلمان .

لەو ساڵانەدا کە ناهید نوێنەری پاڕلمان بوو یان لە گوندی سلێمانکەندی دەژیا ، هەل ودەرفەتی موتالای قووڵ وهەراوی دەست دەکەوێ ولە تاریخ وئەدەبی ئێران و کوردستاندا دەبێتە پسپۆڕێکی بێ وێنە ، لە بیرەوەریەکانیدا دەنووسێ :

" بەپێویستی دەزانم باسێک لەو کتێبانە بکەم کە لەماوەی حەسانەوەی کورتی خۆمدا نووسیومن . لەساڵی ١٣٠٠ی هەتاویدا کە لە گوندی یەکشەوەبووم قامووسێکی کوردی ـ فارسی کە لەمێژ بوو دەستم پێکردبوو تەواوم کرد. ساڵی ١٣٠٢ پاش گەڕانەوەم بۆ گوندی سلێمانکەندی نووسینی دووکتێبم بە ناوی "چگونە بە مریخ رفتم" ( چلۆن چوومە مریخ ) و"پهلوانان گمنام" (پاڵەوانانی نەناسراو) دەستپێکرد . بەرگی یەکەم و نیوەی بەرگی دووهە میشم نووسی وباقی یەکەم لە تاران تەواو کرد. هەروەها بەرگی یەک ودووو

سێی "پەهلوانان گمنام"م لە سلێمانکەندی نووسی وبەرگی چوارویێنجیشم لەتاران تەواو کرد. کتێبێکی دیکەشم بەناوی "ئەحمەدورەعنا" گەلاڵە کردووە کە هێشتا بۆم تەواو نەکراوە. دیسان کتێبێکی دیکەم بەناوی "تکوین کائنات" (پێکهاتنی دنیای هەستی) لە تاران نووسی وئێستا چەند کتێبی دیکەم وەک "پرۆفسۆر دریاس" و "عەزیز چەکمەسوور" و "مصاحبە با شیطان" (وتوویژ لەگەڵ شەیتان) بەدەستەوەن وخەریکم تەواویان بکەم."

تاران چاپی کردووە.

ئەم کتێبە ئۆتۆبیۆگرافی نووسەرە و سەرگوزەشتی نووسەر لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا نیشان دەدا ولەباری مێژوویی یەوە خاوەنی بایەخێکی زۆرە.

باقی نووسراوەکانی ئەم نووسەرەپایە بەرزە بەداخەوە لەچاپ نەدراون .هیواداریـن بدرێن بە ناوەندی بلاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی وکەلکی پێویستیان لێ وەربگیرێ.

## خوالێ خۆشبوو عەبدوڵلا ناهید (ئیفتیخار) زانایەکی گەورەی کوردە کە ساڵی ١٢٧٠ی هەتاوی لەشاری سەقز لەدایک بوو و ساڵی ١٣٤٤ی هەتاوی لە گوندی سلێمانکەندی سەقز کۆچی دوایی کرد.

بەم چەند دێڕەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە عەبدوڵلا ناهید (ئیفتیخار) یەکێکە لە پڕکارترین نووسەرانی کورد ولە نووسیندا گەیوەتە پلەیەک کە بتوانێ چەند کتێبان پێکەوە بنووسێ .ئەوەش دەبێ بزانین کە تەنیا نووسەری زۆر پسپۆر وشارەزا دەتوانێ لە کاتێکدا لەسەر چەند بەرهەمان کار بکا.

لەم کتێبانەی باسمان کردن تەنیا جلدی یەکەمی "پهلوانان گمنام" و" چگونە بەمریخ رفتم" لەچاپدراون ."پهلوانان گمنام" بابەتێکی مێژوویی یە کە دەگەرێتەوە زەمانی دەسەلاتداری مەغوولەکان ولەباری چیرۆک نووسینەوە پەرداغە وزۆر بەهێزوپتەوە.

" چگونە بەمریخ رفتم" داستانێکی خەیالی یە کە وەک بەرهەمەکانی ژوولوێرن مایەی زانستی هەیە.

یەکێک لە بەرهەمەکانی تری ئەم نووسەرە " بیرەوەری یەکانی من "ە کە بە فارسی نووسراوە وقازی ـ ئەحمەد لە ساڵی ١٣٦٣ لە

ناهید هەرنووسەر نەبوو، وێنەگەری (نقاش) وەک خۆی لە ئێراندا کەم بوو. تابلۆی زۆر بەنرخی لەپاش بەجێ ماون کە هێندێکیان لە کتێبخانەی مەجلیسی شوورای ئیسلامی هەلگیراون وهەندێکی تریشی لەنێو خزموقەومان بلاو بوونەوە کەهەریەکەی نموونەی دەسترەنگینی وکارجوانی ئەم زانا بلیمەتەن.

فەیزوڵلاخانی ناهید وێنەگەری بەناوبانگی ناوچەی سەقز برای عەبدوڵلا ناهیدە وبۆمان دەردەکەوێ کەهونەر بەمیرات بەو بنەماڵە گەیشتووە.

وەک کەس وکاری خوالێ خۆشبوو دەڵێن ،ئەو زاتە تاری زۆر چاک لێداوە ومۆسیقای زۆر باش ناسیوە .ئەمرۆ هەر لەوبنەماڵەدا کاک محەممەدی ناهید یەکێکە لە مۆسیقی زانانی کوردستان ولەبووژاندنەوەی مۆسیقای رەسەنی کوردیدا زۆری زەحمەت کێشاوە.

دەستەی نووسەرانی سروە

# لەشکری

ئەحمەد بەحری

یەکێک لە قۆڵە هەرە گرینگەکانی فۆلکلۆری ئەدەبی کوردی بەیتە. بەیت ئاوێنەیەکی بالانوێنە لە ژیانی ساکاری کوردەواری. بە هۆی نەبوونی ئەدەبی نووسراوە بە درێژایی سەدان ساڵ بەسەرهات و رووداوەکانی نێوکۆمەڵ خراونەتە قالبی بەیت وسینگ بە سینگ و بەرە بە بەرە پارێزراون. هەوێنی بەیتەکان لەعیرفان ومەزەب و رووداوە مێژوویی یەکان و ئەوینی پاک وبێ غەل وغەشی تایبەتی کوردەواری هەڵێنجراون بەدەمی چازانان و لێزانان داڕێژراون و بە دەنگی خۆشخوانان، لە دیوەخان ومزگەوتان، لە کونجی ماڵی هەموو کوردێک گوتراون ومەجلیسیان پێ رازاوەتەوە.

بەیتبێژان پەردەی زەمانیان وەلا ناوە. هەست، دڵەخورپە، قارەمانەتی، داب ونەریت و..." رووداوەکانیان ژیاندۆتەوە و مێشکی گوێ دێرانیان پێ زاخاو داوە. ئەگەر حەول وتێکۆشانی خۆشخوانان نەبا، ئەو خەزێنەش وەک زوربەی قۆڵەکانی تری فۆلکلۆرەکەمان خوڵی فەرامۆشی بەسەردا دەکرا و ئیمڕۆ ئێمە لێی بێ بەش دەبووین.

پاراستنی زمان لە بەیتەکاندا شتێکی زۆربەرچاوە ئەگەر بەجوانی لێیان ورد بینەوە زۆر وشەی رەسەنی تێدابەدی دەکرێ کە دەتوانن بینە بەردی بناغەی زمانە یەکگرتووەکەمان. لەبەر ئەمە ئەمەگی بەیتبێژان لەسەرشانی هەموومانە، نابێ لەبیریان بکەین ولانی کەم دەبێ بە نووسینی بەسەرهاتیان ئەرکی سەرشانمان سەبارەت بەوان بە جێ بێنین.

بەداخەوە هەربەیتبێژێک کەئەجەل بەربینگی پێ گرتووە وگیانی لێ ئەستاندووە نێرەکەشی لەگەڵ خۆی بردووە. **ئێستا ئێمە لە بەیتبێژانی کۆن کەس ناناسین، تەنیا عەلی بەردەشانی و یەک دووکەسی دیکە نەبێ، کە ئەوانیش ژیانیان لەگەڵ ئەفسانە تێکەڵاوە وهەڵاواردنی راستی و چەوتی بەسەرهاتیان کارێکی چەتوونە.**

یەکێک لە بەیتە هەرە مەنشوورەکان بەیتی "**لەشکری**"یە. لەبارەی چۆنیەتی خولقانی ئەو بەیتە چەند شێوە بۆچوون لەنێو خەڵکدا لەسەر زمانانە. هێندێک پێیان وایە بەیتی لەشکری "بابی لەشکری" دایناوە هێندێکیش دەڵێن لەشکری وبابی بەدووقۆڵی گوتوویانە. هێندێک دەڵێن لەشکری عاشقی "**خانزادەخان**"ی خوشکی "**خان سولەیمان خانی قوڵی بەگی**"یان"بووە وهێندێکیش دەڵێن نەخێر عاشقی "**مێری**

مەدیان"بووەچونکە بەیتی لەشکری وبەسەرهاتی لەشکری دەچێتەوە سەر خان سولەیمان خانی قولّی بەگی یان.پێویستە لە لاپەڕەکانی مێژوودا لێکۆ- ڵینەوەیەکمان لەسەر ئەو سولەیمان خانە هەبێ .

شەرەفخان لە شەرفنامەدا باسی کردووە وبەشەش پشتان بردوویەتەوە سەر "کەڵۆس" گەورەخانەدانی بنەماڵەی سۆرانەکان.باسی هونەروەری و دادگەری وهەژارپەروەری ئەو پیاوەی کردووە و دەنووسێ:" لەساڵی ١٥٧٧ی میلادی (٩٨٦ هجری قمری)دا هاتۆتە سەرکار ولەساڵی ١٥٩٠ (٩٩٩هجری قمری) مردووە "ئیتر باسێکی لە دەرماندا وکرانی بەدەست رۆمی یەکان نەکردووە .

ماموستا هەژار لەپەراوێزی شەرفنامەدا لە زمانی محەممەدمەولوود (مەم)ەوە بە

پێنج پشتان گەیاندوویەتەوە ، سەر کەڵۆس و دەنووسێ "سولەیمان خان بەگزیکاری والی بەغدا لەناو براوە". بەداخەوە نەینووسیوە کە ماموستا مەم لەوبارەوە چ بەڵگەیەکی بەدەستەوە .

ماموستا حوزنی موکریانی لە "مێژووی میرانی سۆران"دا لەبارەی هونەرپەروەری خان سولەیمان خان دوادوەدەنووسێ لە (حەسەن ئاوا )ی ئەردەڵان یەکەعولەمای بەناوبانگ مەلاحەیدەر باپیرەگەورەی بنەماڵەی حەیدەری ماوەران و هەولێروبەغدا ومەلا ئەبوبەکر باپیرەگەورەی مەلا گچکە (مەلا ئەفەندی مەلائەبوبەکر)ی هەولێری وئەحمەدئەفەندیی ئەعیان کەهەر دووکیان کانی فەزل (فضل) و هونەروزانستی کوردستانن،بردنیە خاکی سۆران.مەلا حەیدەری لە هەریر ومەلا ئەبووبەکری لە هەولێر دامەزراند .لەو دوو گەورە زاناکوردانە عیلمپەروەری بەست وکوردستان هەتا ئەمڕۆ لەوانەوە فێری زانست بوون". هەروەها دەنووسێ:"ناو و نیشان وئاساری سولەیمان بەگ هەتا ئەمڕۆکەش لە کوردستاندا هەرماوە ،بەدەنگ وخۆشخوانی وپێ داهەڵگوتن بەیتی سولەیمان بەگ دەبێژرێ کە پیاوێکی دادگەروتێگەیشتوو وئازاوبەناوبانگ بووە . گۆڕەکەشی لە هەولێرە .

لەپێشدا کوتمان کە چۆنیەتی خولّقانی بەیتی لەشکری بەچەند شێوە لەنێو خەڵکدا باوە .لێرەدا شێوە- یەکیان دەخەینە بەرباس کە هێندێک لەبەیت بێژان ، دەیکەنە سەرەتا وبەرلەدەست پێ کردنی بەیتی لەشکری بە قسە دەیگێڕنەوە .

"مەحموود"کوڕێکی داسنی بوو . لەسەرچۆمی"کەڵو"ێ جێی دە دوازدە ربە"جۆ"یانی بە پێمەرەی خۆش کردبووودەیچاند. هەموو ساڵێ وەختی قات و قڕی بن مەڵۆیە دەستی دەکرد بە درووندوەی ولەسەر بەڕدی، بە کوتکی دەیکوتا ولێی دەکرد وپێی دەگەیشتەوە نوێیان ! ساڵێکی ئەو بەڵە زەوی بە چاکی دەگرێ.جۆی بە قەوەت مل لە بەرملی یەک دەنێ و هەرەمێ دەکا ،بۆوەی نابێ لە سەربەڕەی بیکوتێ . دێنێ خەرمانێکی بە گەردەی بۆ دروست دەکا .لە ماڵێ دونیا یە هەشت بزن شک دەبا و پیرە دایکێک .پیرەدایکەی دەکاتە بنە وبزنان لە گێرەی دەکا و خەریکی وردکردنی خەرمانی جۆدەبی .

"خان سولەیمان خانی قولّی بەگی یان"هەر لەو ڕۆژانەدا ئیشتیای راوێ دەکا وبە حەوسەد سوارەوە دێتە سەر چۆمی کەڵوێ بە هەڵکەوت تووشی خەرمانی مەحموودی

دەبێ.کەجاوی بەوحاڵە دەکەوێ زۆری پێ سەیر دەبێ! دەبینێ ئەوە کوڕێک هەشت بزنی دەگێرەی کردووە وپیرێژنێکیش دەبەندی دابە وکوڕە دەنگی لێ هەڵێناوە وئەوی دەیلێ نایلێتەوە! راوێ بەتاڵ دەکا .بەخۆی وبەسوارانی لە دەوری خەرمانی مەحموود دادەبەزێ.مەحموود بەپیریانەوە دەچێ.خان خۆشی لێی دێ ودەستور دەداتە سواران بە ئەسپەکانیان خەرمانەکە سمکوت کەن و کاو دانی بۆلێک کەنەوە .زەمانی قەدیم هەر سەردارەی چەند خۆشخوانی هەبوو. ئەو خۆشخوانانە لەکاتی شەڕ و سەفەردا بەدەنگ وسەدای زوڵاڵیان بەلەشکریان هەڵدە- کوت و ورە وتوانایان دەبردە سەر. هەر وەها لەکاتی حەسانەوە ووچانێدا بەزمیان بۆدەگێڕان و ماندوویەتیان لەبیر دەبردنەوە .خان سولەیمان کە گوێی لە دەنگی مەحموود بوو دیتی شیاوی ئەوکارەیە ،داوای لێ کرد ببێتە پیاوی وخۆشخوانی لەشکری بۆبکا .مەحموودیش قەبووڵی کردو لەوێ روژێ را بە "لەشکری"نێوبانگی دەرکرد.

لەشکری کوڕێکی زۆرلێهاتوو بوو.وردە وردە لە دیوەخانی سولەیمان خاندا جێی خۆی کردەوە .پلە بە پلە چووە سەر هەتا جێیەک کە بوو بە راوێژکاری خان وخان هەست و نیستی خۆی لەمستی نا .دەڵێن خان سولەیمان دوو ژنی هەبوو بە نێوی "فاتمی ناوخۆشیان " و "ئایشی حاجی حوسێنی".لەو دوو ژنە منداڵی نەبووە بەناچار کچێکی داسنی بەنێوی "مێری مەدیان" دەخوازێ. لەشکری بەرلەوەی ببێتە پیاوی خان،ئاشقی ئەو "مێر"ە دەبێ.کەنێوی خان دێتە گوڕێ بەردێکی لەسەر دادەنێ و وازی لێ دێنێ .بەڵام لە دڵی ناچێتەدەر .وردە ،وردە بوغز و قین هەست ومێشکی دادەگرێ، خانی لەپێش چاو رەش دەبێ و وەک ماری بریندار لە هەلێک دەگەڕێ ژەهری خۆی بڕێژێ و تۆڵە لە خان بکاتەوە .خانیش بێ خەبەر لە دەروونی رەشی لەشکری جڵەوی کارەکانی هەر وەها لەدەست دەنێ وبەکوڕی ماڵێی دادەنێ.

ئەوەدەمی رۆمی یەکان "ئەگەر بڵێین عوسمانی یەکان راسترە" دەسەڵاتیان بەسەر ناوچەدا شکاوە ودیارە خان سولەیمان خانیش دەبەردەستی ئەوا ندابووە. جارێکیان لەشکری سەبارەت بە کارێک دەنێرێتە دیوانی رۆمییان. لەشکری ئەوهەلەی لێی دەگەڕا وەدەستی دەکەوێ وبە هەر شێوەیەک بێ دڵی رۆمییەکان سەبارەت بەخان دەگۆڕێ. هەر بۆیەخان بانگ دەکەنە دیوانێ وبە پیاڵەیەک ژەهر دەرماندنداوی دەکەن.

پاش ماوەیەک ژنەکانی سولەیمان خان هەست بەوە دەکەن کە مێردەکەیان بە شۆفاری ودووزمانی لەشکری دەرماندناو کردوە .قۆڵبەستی دەکەن ولەشانان بەرەخوار لە مۆرەی دیواری دەگرن و خەڵکی لە دەوری کۆدەکەنەوە، وپێی دەڵێن :جابڵێ بزانین خان سولەیمان خانت چۆن بە دەرماندناوکردن دا!؟.

لەشکری کە دەڕوانێتە رابردووی بابردووی خۆی غوربەتی هەڵیدەگرێ ودەروونی دێتەجۆش ودەنگ هەڵدێنێ و بەسەرهاتی خۆی وخان سولەیمان خانی قوڵی بەگی یان بە سۆزەوە دەگێڕێتەوە .هەر ئەو گوتنەی لەشکری یە کە ئێستا بە بەیتی "لەشکری"مەنشورە دوای ئەوەی گوتنەکەی کۆتایی

پێ دێ توپە قوڕێکی بە زاری یەوە دەدەن. لەشکری ئەو بەیت بێژەی کەبەسەرهاتی لەگەڵ ئەفسانە تێکەڵ بووە لە مۆرەی دیواردا سەر دەنێتەوە .

**تەواو**

# فەرزندە

لاوۆ چێبن، چێبخەبتن، ئەسکەرێ ڤی زالمی
ژ مەڕا هێ هنکە."

ئاغایۆ نەمینم ماقوولۆ نەمینم...

وەزێ نەمینم ژ عەشیرەتا حەسەنا ڕا
میرۆ نەمینم نەمینم...

ئاغایۆ... وەێ ئاغایۆ

ئاغایۆ وەزێ ل دیارێ دۆنکا شەوتی
مەندەلغا کاڤل کەتم وێ دخاردا.

دو هەزار حەڤسد ئەسکەرێ ڤی زالمی

ئاغایۆ... ئاغایۆ...

ئاغایۆ وەزێ ل دیارێ دۆنکا شەوتی
مەندەلغا کاڤل کەتم وێ ب مەندکە

گوللال سەر سەرێ فەرزندە ئاغایێ
عەشیرەتا حەسەنادا تکەتکە.

هەگەر هوونێ سالخ و سوولخێ فەرزندە
ژ من دکن، میرۆکی ب دلی، چار گورچکە.

فەرزندە ل حەرافێ مەیدانێ ل عەڤدلباقی
کرە گازی کەرەمێ قولاغازی، گۆ: " چل قەد!

## پاشماوەی حوکمی نارەوا

لێشم بدەن وپووڵیشیان بدەمێ! ئەمە زوڵمە،ناحەقی یە،کوا خودا هەڵدەگرێ.؟

قازی ودەروێش هەروا، خەریکی قسەبوون،پیرەش فکری لەوە دەکردەوە کە هەر شەپلاغەی بایی سێ دینارە،لە پڕ چاوی بەپشت ملی حەنابی قازی کەوت،زۆر لەپشت ملی دەروێش پان ولووستر بوو، لە خۆشی پان بزەی بەلێودا هات قازی ودەروێش نۆرەی قسەی یەکتریان نەدەدا وئاگایان لە هەموو شتێک برابوو. مامەپیرە بارێزی بۆقازی برد بە هەموو دەمای خۆی لەپشت ملی قازی راکێشا و دایە قاقای پێکەنین وگوتی :

- تۆش بێنە سێ دینارم بدەیە،ئەوجا بێ حیساب دەبین.دیسان دایە قاقای پێکەنین.

قازی زۆر تووڕە بوو بەڵام دەروێش زۆری پێ خۆش بوو،دەستی رۆهێشتە گیرفانی وهەموو پووڵەکەی دەرهێنا و گوتی :

- فەرموو بە قوربانت بم، ئەمە سێ دیناری خۆموئەمەش سێ دیناری قازی،قەیدی نیە من دیدەم.پاشان قاقا پێکەنی. قازی بەتووڕەیی گوتی :

- ئەمە چ قسەیەکە، **چۆن تۆ پووڵ دەدەی لەمن بدەن ؟!**

دەرویش گوتی :

- ئەرێ وەڵلا، شەپلاغە ئەگەر باشە بۆ هەموان باشە، ئەگەرخەراپیشە بۆهەموان خەراپە. حەیف پووڵی دیکەم پێ نیە، دەنا ئەم شەپلاغەی دوایی هەزار دیناری پتر دێنا،چونکە جەزای حوکمی نارەوا بوو، ماڵمحەقە زۆربەجێ بوو!

* ئیش: شەپلاغەکە لەپشت مل بدرێ

---

←

کشیایە سەر فەرزندە دۆرا قەلاچا فەرزندە کرتنە ژ ئێڤاردا

فەرزندە ل حەرافێ مەیدانێ عەقدلباقی کرە کازی، عەقدلباقی ل کەرەمێ قولاغازی کرە کازی گۆ: "چل قەدا لاوۆ، چێبن، جێ بخەبتن، سەرێ مە نەچێترە ل سەرێ شێخ سەید ئەفەندی، شێخ عەلی، شێخ مەلەکا ئیرۆ سێ رۆژ و سێ شەڤە دارا غاجا دیار بەکرێ مایە داردا."

ئا غایۆ...نەمینم...

ماقوولۆ...نەمینم...

وەزێ نەمینم ژ عەشیرەتا حەسەنارا، میرۆ...

ئا غایۆ...وەی ئاغایۆ...

ئا غایۆ وەزێ ل دیارێ دۆنکا شەوتی مەندەلغا کاڤل کەتم وێ لناڤادنێ،

دو هەزار و حەڤسد ئەسکەرێ ڤی زالمی کشیانە سەر قەلاچا فەرزندە بهوجووما لێخستنێ،

روو سمبێلی فەرزندە ژ بۆیاغا گوللێد بارووتێ خال کەتنێ،

ئاغایۆ نەمینم، ماقوولۆ نەمینم

وەزێ نەمینم ژ عەشیرەتا حەسەنارا

میرۆ...

# دایک

دیاری غەفووری

کلاسی چوارەمی دەبیرستان بووم ،ڕۆژی یەکەمی دوای وچانەی نەورۆز بوو، زەنگی یەکەم ئینشامان هەبوو ،دەبوایە لەبارەی "ڕۆژێک لەژیانمان" بنووسین، بەڵام من لە یەکەمین ڕۆژی نەورۆزەوە هەتا ئاخرین ڕۆژ ،ئەوەی بیرم لێ نەکردبۆوە دەرس وفێرگە بوو، چۆنم کتێبەکان لەسەریەک دانابوو، هەروا مابۆوە بێ ئەوەی لێکیان بکەمەوە.

قوتابیەکان هاتنەوە کلاس ... لەهەرلایەکەوە ئەو دەنگە بەرز دەبۆوە :

"خۆمن نەمنووسیوە ،بابەتی ئینشاکەم لەبیر چووبۆوە".

ئەوی تریش دەیگوت :

هەر لەبیرم نەمابوو و...... لەمباسانەدا بووین کە موبسیر گوتی :

—مامۆستا هات!

مامۆستا هاتەکلاس و هەموو هەستاین ، گوتی :

— دانیشن ....

پاش چاک وخۆشی وجێژنەپیرۆزە مامۆستا گوتی :

— ئێستاش با بێینە سەر دەرسەکان .دەفتەری حازر و غایبی کردەوەوناوەکانمانی یەک بەیەک خوێندەوە ،وکەس غایب نەبوو ،ئەمجار چاوی بە ناوەکانماندا گێڕا تایەکێک بانگ بکا .قوتابیەکان متەقیان نەدەکرد، کلاس ئەوەندە بێ هەست وخوست بوو کە گوێمان لەدەنگی دڵەکوتەی یەکتر دەبوو. لە نەکاو مامۆستا گوتی :

— ئەحمەدی ،ئەحمەدی بێ ،

من دنیام لێ تاریک بوو بەڵام ئەوانی تر پشوویان هاتەوە سەرخۆ. هەستام دەفتەرەکەم لەگەڵ خۆ برد و دەستم پێ کرد :

"ڕۆژێک پێش یەکەمین ڕۆژی ساڵی تازە ،کاتێک کە لە قوتابخانە وەدەرکەوتم ،لە پێش هەمووشتێکدا بۆلای سینەما چووم‌تا بزانم فیلمی تازەیان چ بۆهاتووە ،چاوێکم لەناوی فیلمەکە کرد و نەختێک ڕاوەستام، دوایە بەرەومال بوومەوە ..... کە گەیشتمە کۆڵانەکەی خۆمان دیتم کەلە پێش دەرگای ئێمە هەراوهۆریا وقەرەباڵغە و هەرجی دراوسێ وناسیاوی ئەم دەوروبەرانە بوون هەمووی لەپێش دەرگای ئێمە کۆ بوونەوە ..... منیش زۆر زوو خۆم گەیاندە بەردەرگا ،لەنەکاو برا گەورەکەم کەتازە لەسەربازی هاتبۆوە چاوبەفرمێسک لەماڵ هاتەدەر ،کەمنی دی لە قوڵپەی گریانی دا .....گوتم :

کاکەگیان تۆخوا پێم بڵێ چ بووە؟

کاکیشم بەگریانەوە گوتی :

— دایکمان سەکتەی قەلبی گرت وتاگەیاندمانە نەخۆشخانە تەواو بوو.

سەرم هەڵێنا وچاوم بە دەوروبەردا گێڕا ،قوتابییەکان دەنگیان نەدەکرد دووسێ یەک لە قوتابیەکان لەسەرەخۆ دەگریان وئەوانی تریش سەریان دەبەرخۆ نابوو مامۆستاش زۆربەخەمناکی یەوە بەقەڵەم حەتی لەسەردەفتەرەکەی دەکێشا ،دەستم پێ کردەوە.

کە براکەم گوتی :

دایکمان عەمری خوای کردووە، کتێبەکانم بۆلایەک توورداوهەڵاتم بۆ ژووری، چ حەشامەتێکی لێ بوو ،هەرخوا بۆخوی بزانێ گوێم لێ بوو یەکێک دەیگوت :

بڕوانە لاپەڕەی ٤٣

# باوه ژن

ئەبووبەکر ئەمیری

رۆژێک فێنکی ئێوارە دەگەڵ دۆستێکم لەبن داری باغی دانیشتبووین وباسی نارەحەتی خۆمان دەکرد، دۆستەکەم ئاوای باسی ژیانی خۆی دەستپێکرد.

لەژیانی خۆمدا قەتم خۆشی نەدیوە. ماڵی ئێمە بەدایمە هەڵلای تێدا بوو. بابم دوو ژنی هەیە هەرکە زاریان هەڵبڕی باس باسی ئەوەیە کە یەکیان دەسماڵ وکەوای بۆکراوە، بۆچی بۆوی دیکە نەکراوە، یەک چەندی کار کردووە وئەوی دیکە نەیکردووە ؟لەسەر کلاسیش هەرفکرم لەو ناکۆکی یانە دەکردەوە وزۆرجار هۆشم بەلای دەرسەکەوە نەبوو هەتا رۆژێک کاکی مودیر داوای لێکردم دەردی دڵی خۆمی پێ بڵێم، منیش چونکە زۆرم خۆش دەویست چۆنەتی ژیانی نالەباری خۆمم بۆگێڕاوە ئەویش بۆوەی ناهومێد نەبم دوای ئەوە کە هەستی بە نارەحەتی من کردبوو بەسەر-هاتی ژیانی خۆی ئاوا بۆ گێڕامەوە:

«من برایەک وخوشکێکی دیکەم هەبوو. کلاسی پێنجەمی سەرەتایی بووم. ماڵی بابم دووبنەکی بوو، یەکیان لەشار کە ئێمە منداڵەکان جگە لە خوشکم لەوێمان دەخوێند. ماڵەکەی دیکەش لە دێ بوو کە دایکم وخوشکم دەگەڵ باوکم لەوێ بوون.

زەوی وزارێکی زۆرمان هەبوو. ژیانمان زۆرخۆش بوو. قەت وانەبوو کە هەست بە کەمایەسی بکەم. سەرەتای هاوین کە فێرگەکان داخران چووینەوە ئاوایی. بابم جۆیەکانی درووبۆوە بەڵام گەنمەکان هێشتا فەریکە بوون جێ جێشی هاتبوو بگاتێ.

حەیفەکەی ئەوە بوو پاساری وەک مارو مێروو لێی دەنیشت وگەنمەکەی دەخواردو توێلکەکەشی دەهێشتەوە. باشارمان نەدەکرد. لەوکاتوساتەدا بابم بەدزی خەریکی مارەکردنی ژنێکی دیکە بوو کە لە دێیەکەی ماڵی بابم بوو. ئێمە هیچمان ئاگامان لێ نەبوو. ماوەیەک بوو رەفتاروئاکاری دەگەڵ دایکم گۆڕابوو. زوو زوو تووڕە دەبوو ئێمە وامان دەزانی لەبەر پرکاری وگرفتاری کشتوکاڵە بابم وانارەحەتە. هەتا شەوێک دوای دروونەوەی گەنمەکان وخەرمان هەڵاویشتن نیوەشەو گوێمان لە هات و هاواری بابم ودایکم بوو. بەپەلە رامان کردە پێشخانە تەماشامان کرد ئەوە دایکم لە قولینچکی پێشخانە دانیشتووەوادەگری سەری بە هەنیسکانەوە هەڵدەقەندرێ. هەرچەند لێمان پرسی بۆدەگری چ بووە؟چ قەوماوە؟ بێ سوود بوو. قسەی بۆ نەدەهات. نەشمان دەوێرا بچینە کن بابم چونکە ئیجازەی پرسینی شتی وامان نەبوو.

هەرچۆنێک بوو دەستی دایکمان گرت وبردمان بۆ مدبەق. فانۆسەکەمان هەڵدا و دانیشتین. دایکم هەروا دەگریا. هەرچەند لێمان دەپرسی جوابی نەدەدایەوە

جگەرەکێشێک پێ چوو سەری لەسەر ئەژنۆ هەڵگرت و رووی تێکردین. بەڵام هەر دەتگوت زمانی بەستراوە. چاوی لێ دەکردین هەروەک قەت نەیدیبین، لەبەری پێمانرا هەتا تەپڵی سەرمان تێی دەڕوانین. ئەوجار خوداوراستان وەقسە هات ولەحاڵێکدا زوو زوو هەنیسکی دەدا گوتی:

رۆڵە بابتان ژنی هێناوە، بەدزی مارەی کردووە ئێستا دەیەوێ بیهێنێتە ماڵێ!!! منیش چەند شەوە خەوم لە چاو براوە حەزناکەم هێلانەمان لێ بشێوێ پێم خۆش نیە ئێوە هەڵوەدا بن پێم خۆش نیە ئازارکێش ورەنج بە

**خەسار بم ،ئەم هەموو خۆشەو یستی ، تێروپڕی وبێ خەم و خەفەتی یەی هەمانە لەنێو بچێ ئەو هەموو زەحمەتەی کێشاومە بەزایە بچێ،بابت بێ ئەوەی پرسێکی بەمن کردبێ**

یان ژیانی ئێمەی لەبەرچاو ، بێ دەیەوێ بیهێنێتە سەرماڵێ ئەوە شازدەساڵە من ژنی ئەو پیاوەم هێشتا بێ پرسی ئەو هێلکەم نەشلەقاندووە بەڵام ئەو بەزەیی بەو ماڵەرەنگینەدا نایە ،چاوی لەوەنیە ئێمە منداڵمان لێک هەیە .ئەوشۆ دەیگوت:

دەیهێنمە سەرماڵێ،جاپێت خۆشە ئەوە ئاوایە دەنا برۆ ودەستم لەکۆڵ کەوە .

دایکم دیسان مات بۆوە منیش کە کورە گەورەی ماڵ بووم هێندێکم دڵخۆشی داوە ، زۆرم پێ ناخۆش بوو بۆ دەبێ باوکم کاری وابکا ؟ منداڵەکانی دیکە خەویان لێ کەوت و دایکم باسی ژیانی خۆشی رابردووی بۆ دەگێڕامەوە منیش گوێم راداشتبوو باسی ئەوەی دەکرد چۆن بە بوون و نەبوونی بابم هاتۆتێ.چۆتە دەسکەنەوبژاروگیارنینەوە بەڵام بابم ئەوانەی لەبیر چۆتەوە . چ دەکرا ؟رووبان لەکێ کردبا ؟ هانامان بۆکێ بردبا ؟ئاخری دایکم لەبەرحەیای خەوی و سەبارەت بەئێمە ددانی بە جەرگداگرت. بابم بێ دەنگێک ژنە تازەی هێنا

سەرماڵ .بەرەبەری ناونووسینی مەدرەسەکان بوو .بەڵام لەبەر ئەورووداوە دڵمان لە دایکمان نەدەبۆوە بابیشم ئێمەی لەبیر چووبۆوە دل خۆشی رابردووم نەمابوو .ئێستا ئیدی ماڵم ساردوسڕومات دەهاتە بەرچاو هەموو جێیەک لەبەرچاوم گۆڕابوو ئەگەر تاوێک خۆشیم لە دڵ

گەرابا بەدیتنی دایکی کلۆڵم هەموو لەنێو دەچوو. وەختی قەرێ قەرێنێ شەو لەبن دیوارەکان هەڵدەترووشکام دەستم دەئەژنۆ وەردێنا و چەنەگەم لەسەر دادەنا .شەش رۆژ بوو بووکی تازە هاتبوو من چوومەوە شار ناونووسیم کرد وهاتمەوە .بووکی تازە یانی دایە نەشمیل رووی خۆشی نەدەدا بەئێمە دەتگوت ئێمە هەموومان لەوماڵەدا زیادین ! هەرچی گوتبای هەر دەبوو قسەی ئەو بووبا هەرچی کردبای هەر دەبوو کاری ئەو بووبا .

مانگێک بوو لە شار بووین بەڵام پڕبەزگی خۆمان نان نەخواردبوو بیستبوومانەوە کە دایکە نەشمیل گوتبووی من قەرەواشی وان نیم بۆشتیان بۆبنێرم. سەری مانگ بابم هات ودایکمی بردەوە.ئەوڕۆژە کە دەهاتین بۆشار قسەی دایکم لەگوێمدا دەزرینگاوە کەدەیگوت: رۆڵە خەریکن ئێمەدوور دەخەنەوە.

دڵم ئۆقرەی نەگرت و پاش نوێژی پێنج شەممۆ برا چووکەکەم لە ماڵ بە جێ هێشت و بە دۆستێکی خۆم سپارد .لە رێگا دڵەکوتەم بوو ،دڵم لێی دەدا زۆر نارەحەت بووم ودەتگوت رووداوێک.دەقەومێ رووداوێکی دڵ تەزێن کە لەوانەیە سەروماڵمان تێدابچێ بەوفکر وخەیاڵەوە گەیشتمەوە ماڵ.بە ئەسپایی چوومە سەربانی،هەتا بەکولانەیدا تەماشایەکی ژووری بکەم وبزانم چ باسە ؟ کەچی تەماشای چ بکەم چم چاوپێ کەوت ؟ دایەنەشمیل دەهات ودەچوو ودەیگوت:

ئایەرۆ جاتەماشای کەن

تووشم بەتووشی چ بێ سەرەو بەرەیەکی هاتووە! کچێ خۆ مانگێکی عەلەنتەواوە خانم بۆی چۆتەشاری ئەلحان هاتۆتەوە بەمن دەڵێ :ئەوەی بکە وئەوەی مەکە ،وەڵڵا بابە شتی چاکە هەر دستوورپیدا - نمان مابوو .خانموخاتوون بۆی دانیشێ ووردکە سەفەری شاری بۆبکا ودەستوورانیش بدا .خۆبابە من هەرمێردم بە یەکێ نەکردووە . باحەمەد کەڵەگا بێتەوە جاخۆم زانی و ئەو. بەخولاّ وبەپێغەمبەری یان ئەمن دەبم یان ئەتۆ . جاچۆن من رۆژ هەتا ئێواری دەستم لە رزق وشیروپەنیر دابێ بۆمنداڵە ریوەڵەکانی تۆ ؟ئەویش لەکوێ ؟ بۆم بچنە شار ولەوێ دەرسم بۆبخوێنن ! نانا چیدیکە قەرەواشی ئێوە ناکەم!

دایکیشم گردەنشین دەستی لەئەژنۆ وەراند بوو، وەک لێقەوماوان ملی بەلاوەنابوو چاوەڕێی رووداوێک بوو کە زۆر لەمەوبەر هەستی بە روودانی کردبوو. ئەوجار دایکم وەجوابهات وگوتی :

- نەشمیل خانم گیان،دایکەکەم ،بەقوربانت دەبم ، دەبەرت دەمرم بۆخۆت دەزانی ماڵ هەر کارێکی نیەوکارێک دەبێ من بیکەم وکارێکیش دەبێ ئەتۆ بیکەی .هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو کە دایەنەشمیل قسەی وی بڕیبوو گوتی :

هەی هووا! هەی هوو نەقڵی رۆستەم وسۆرابە ! من دەڵێم کلّفەتی ئێوە ناکەم ! نا، یان دەبێ من لەوماڵەدا بم یا ئێوە دەوقسانەدا بوون بابم هاتەوە ژوور .لە دایە نەشمیلی پرسی ئەوە چ باسە ؟

دایە نەشمیل :

- جا چ باسە خۆتۆ هیچت لە دەست نایە منت هێناوە بۆ شەڕ.بەگژ قەرەچی وسازندانت -دا کردووم .لەهەوەڵی نیوەڕۆیەوە زاراخانم بەربینگی پێ گرتووم ئەوەی ، بێ فەزیحەتی یە پێی کردووم. دەڵێ دەبێ ئەوەی بکەی و ئەوەی نەکەی .کلّفەتیم پێ دەکا .دەیەوێ بمە ژێردەستی هەتیومەتیوان .

ئەوەندەم زانی بابم بەمست وپێلاقان وەرگەڕا دایکم. منیش هەرپێم وابوو گڕو کفێکە وخلاس دەبێ .کەچی دایکم لەتاوان گوتی :

- خودا غەزەبت لێ بگرێ ژنەکێ ،وەک ماڵە منت تێک دا. ئەوجار دایەنەشمیل دەستی دا کوڵەوەژو وەرگەڕانە دایکم . منیش دەستم بەهات وهاوارکرد وخەڵک دایکمیان لەبەردەستی ئەوان دەرێنا .بابم من و دایکمی دەرکرد وبراچووکەکەم وخوشکم مانەوە .

سەری خۆمان هەڵگرت دەگەڵ دایکم چووینە شار . مەگەر خودا بزانێ چمان بەسەرهات . لەچەند دەرکەمان دا ،چەند کەس بێ وڵامی هێشتینەوە .دوای چەند مانگ. بیستمانەوە کە خوشکەکەم دەرماندا و کراوەونەش گەیوەتە دوکتۆرومردووە. برا چووکەکەشم دەستیان پێ لە خوێندن هەڵگرتووە. بەوەهەموو داخ وحەسرەتەوە شاگردی قاوەچی یەک بووم ،دەرسەکەم هەر خوێند ،دایکم جل شۆری ماڵانی دەکرد ،بەڵام بەداخەوە لە عەیبەتان چاوەکانی مرواری یان هێنا وگردەنشین ماوە .

باکورتی ببڕمەوە ،چەرمەسەری یەکی زۆرم دی .ئێستاش ئەوەتا ئێرەم هێناوە.ئەو قسانە دڵیان ئاوپرژێن کردم . لەو رۆژە بەدوا ئیتر دەرسەکانم بەباشی دەخوێند زانیم دەرس نەخوێندنی من چارەی دەرد نیە وهیچ دەردێک دەرمان ناکا .هەربۆیە شەو و رۆژ دەرسم خوێند . لیسانسەکەم وەرگرت دایکم ومنداڵەکانم هێنا لای خۆم . تابۆ هەمیشە دوایی بەو ناکۆکی ودووبەرەکی یە بێنم وەهەموو لا ژیانێکی خۆشمان بێ .لێکیان دوور راگرم تا بەڵکوو ئێمەش وەک زوربەی ماڵان لەخێروخۆشیدا بین .

---

## مەحوی

بەیانی هەرکە تۆ دەرکەوتی نەیما رۆژهەڵاتن باس
لەشەمعی نیوەڕۆ داگیرسیاوی کێ دەکاتن باس

عینانی مەوجی دەریا بەربوو دونیا ماڵی وێرانە
مەکەن هەرگیز لەوانەی دائیمەن بێ دەنگ وماتن باس

بە کێوێکی بڵیندم وت کە چەرخی چنکی دەووار ی
وتی عەیبە مەکە هەرگیز لەوانەی بێ سەباتن باس

لەباسی شێخ وسۆفی پاکەوەک گوڵ مەجلیسی رەندان
کەناکەن قەت لەدڵ مردوو ئەوی ئەهلی حەیاتن باس

لەسەجدەی بەردەری،رۆژێ لەپاشم،دڵ دەبێتە خوێن
بکەن هەرگا لەوانەی تارکی فەرزی سەلاتن باس

قەدەح نۆشانی بەزمی وەسڵ ناکەن یادی مەهجووران
لەئەهلی دووزەخ ئاخر ئەهلی جەننەت بۆدەکاتن باس

نەهاتم ئاخری ئەڵبەت بەمردن هاتووە " مەحوی "
هەتا ئێستا کە بۆچی نەیبووە جانانەهاتن باس

## سەید کامیل

تک تکەی گوێسوانەکانی وەک زوخ وی من دەچێ
رەنگیسیخواری وەکوو ریشی سپی کاری منە

بۆسپیکاری عەجەب وەستایە زستان چاوەکەم
وەک خەمی من مووی سپی کردووم ومیعماری منە

پیێچەوانەی خۆی کەجاران چەرخ وخول بووکاری ئەو
هەردەڵێ شان وملی "کامیل" وەفاداری منە

## «موعەلیم» «حەقیقی»

ئەی معلم ئەی فریشتەی رووی زەوی
ئەی سروشت ورێ و رەوشت مەعنەوی

تۆ چرای رێ لێ گومانی بێ گومان
تۆ قەرەولی رۆژ و کێشکچی شەوی

دابی زانین فێری مندالان دەکەی
خاوەنی هەستی نەوەستی ناکەوی

تۆ نەبی منداڵ خولن دەخولێنەوە
ئەو لەوی دەکوتێ بەمستان ئەملەوی

تورێ وا دەگری بە تۆری ماریفەت
بازی وەحشی ئەهلی یە و کێوی کەوی

بۆ بەیانی باشی دەرسی بێچوان
تا بەیانی بێ وچان دانا کەوی

داری خۆشی کەی بەبێ تۆ دێتەبەر
سەروی نازی نەخلی بەرزی نانەوی

چالی نازانی لەسەر رێی کۆرپەمە
دڵنیام چون تۆ تروسکە وپەڕتەوی

بۆ خەلە و خەرمانی زانین و هونەر
هێلەگی جێ ورد و بێژنگ و کەوی

دەنگی تۆ نەغمەی سرووشی غەیبی یە
زەنگی تۆ خۆشتر لە سەدقاسپەی کەوی

هەر ئەتۆ کردووتە هەستی ژانیگەل
هەر ئەتۆ چێشتووتە چێژی بێ خەوی

تۆ کە بەرپرسی پلەی فێرکردنی
تەربیەت کەمتر نیە پایەی لەوی

چاو لەدەستی تۆیە دایکی نیشتمان
رۆڵەکانی تەربیەت کەی نەسرەوی

چون لە سایەی تەربیەتدا زیندووە
داری ئازادی وتەن و رووحی قەوی

خوێندنە هۆی راپەڕینی هۆزەکان
هەر بەوی خەڵکی زەوی چوون بۆجەوی

با هەر ئی تۆبێ کەلیمەی کوڵ نەدەر
راپەڕە، تێکۆشە، با هەر سەرکەوی

گیانەکەم پەندی حەقیقی بگرە گوێ
تا بە فریات بێ خودای بەرزونەوی

# دەرویش عەبدوڵلا

بە رەنگی زەردو شێوەی دەست وشمشاڵی کزا ،دەروێش
حەزم کرد بدستدیەک ببیەم سەرا سەر حوزن وماتەم بێ
لە سیماتا بەدیم کرد هەیکەلی عومرێکی حەسرەتکێش
وەها دیارە کە بەختت ئاشنای بولبولی خەم بێ

* * * *

بەڵێ،دیارە ، لەدنیاو قەومی بەستیا قەدری سنعەتکار
وەکوو عەکسی قەمەر وایە لەدنیاو حەوزێکی لیخندا
بەڵام تەختی رەفاد وتاجی حورمەت میللەتی هوشیار
بە ئوستادێ ئەدا وەک تۆ لەناو شمشاڵی کون کوندا

سەحەر پێنێتە گریان وقسە سیحری پەری نەغمە!
برای دەروێش! ئەزانم بۆمەعیشەت وێڵ وئاوارەی
بەرەهری ناعیلاجیتە لە ناکەس وێستنی لوقمە
بە مردنتە کە گوێی ناشی ئەخنکێنێ خرۆشی نەی

بەڵام چی بکەین لە ناوچاوی رەشی بەعزێ زەکای گەورە
وەکوو تۆوی گوڵی دەمبا لەسەر بەردێکی رەق ئەڕوێن
ئەگەر خیلقەت نەسیبی عومری تۆی مەحکوومی ئەم دەورە
نەکردایە ،خوا عالم، لەکام عەرشت ئەسوو داوێن

* * * *

نەحەرفی مەکتەبێکت خوێند ، نە ئوستادێ بەڵی گرتی
سیرف بەرزی زەکا ئەم سنعەتەی فێرکرد بە شمشاڵت
هەموو وەزنێکی گۆرانی لە توولانی هەتا کورتی
بەسەر پەنجەی هونەر کردت بە دیلی کۆششی زاڵت

* * * *

ئەوەندەم بیست لە مۆسیقا خرۆشی رۆحی بێگانە
مەزاجی کوردەواریم تێکچووە ، دەروێش عەبدوڵڵا
دەخیلت بم بدە بەو لاوک و ئای ئای و حەیرانە
شەپۆلی زەوقی میللی پڕ دەروونی مات و چۆڵم کە
لە بێتهۆڤن گەلێ زیاتر بەرۆحم ئاشنای وەڵڵا
دە ، ئەی دەروێش ، سکالایەک لەگەڵ رۆحی کلۆڵم کە

## عومەر فاڕووقی

لەمێژووی ئەدەبی گەلی کورددا زۆرجار ناوی فەقێ تەیرانمان بیستووە بەڵام کەمکەس هەن کە لە چۆنەتی ژیان وبەسەرهاتی ئەم شاعیرە پایەبەرز وشۆڕشگێڕە ئاگاداربن . هەرکەسە هاتووە چەند دێڕی نووسیووە وبەجێی هێشتووە .تەنانەت خوالێ خۆشبوو "**ئەحمەدی خانی**" لە دیباچەی "**مەموزین**"دا جارێک ناوی **فەقێ تەیران وعەلی حەریری** بردووە و هەر ئەمە زۆرکەسی لە ئەدەب پەروەر و موحەقیقان ئاگادار کردووەکە بەڵێ لەپێش "**ئەحمەدی خانی**"دا گەلی کورد شاعیری گەورەی وەک "**فەقێ تەیران**" و "**عەلی حەریری**" بووە ،بەڵام لەمە زیاتریان لێ نازانین. لە دیوانی "**مەلای جەزیری** " دا دەبینین کە مەلا وفەقێ تەیران پێکەوە باسێکی فەلسەفی یان بەشیعر لێک پرسیوە وجوابیان داوەتەوە، کە مامۆستا هەژار شەرحی کردووە بەڵام بەداخەوەئەویش ئەوەندەی خۆ زەحمەت نەداوە تا ژیان وبەسەرهاتی فەقێ تەیران بۆخوێنەر روون ، بکاتەوە .تەنیا ئەوەندەی باس کردووە کە (ح.م) واتە نازناوی فەقێ لە (حم) کە سوورەیەکی قورئانی پیرۆزە وەرگیراوە کەچی بەبڕوای من مەبەستێکی تر لە ئارادایە .

جا وتووێژی مەلاوفەقێ ئەوەمان بۆدەردەخا کە هەردووک هاوچەرخن ونێوانیان زۆرخۆش بووە .وتووێژەکەیان بەم چەشنە دەست پێدەکا .

فەقێ :

**سوئالا من حەقیری**<br>
**سەدەفەک دڤێ کوتێکەن**<br>
**ئیرۆکە لە جەزیری**<br>
**حەقە کول"مەلێ"کەن**<br>
**هیلاک ژ دەربا تیری**<br>
**چ دەرمان هەیە لێ کەن**

مەلا :

سەلامێن ملیاکەتان
بێ حەددو بێ حەسێبن
شوبهەتێن ئاقێ شەتان
ژ"مەلا"ل"میم وحێ"بن
هیلاکێن ژ زەحمەتان
دەرمان ژ لام وبێ بن

فەقێ: پرسیاری منی فەقیرو هەزار بخەنە نێو سەدەف وبیبەنە خزمەت مەلا کە لە شاری جەزیرە ..... ئاخۆ برینی تیران چارو دەرمانی چیە؟

مەلا: سڵاوی مەلائیکەتان بەقەد ئاوی شەتان و لە ئەندازەو هەژمار بەدەر لە مەلاوە لەسەر میموحێ بێ .... بەخۆشی ئەرک و ئازاران دەرمانەکەی لە لێوانە.

دیارە ئەوانەی دیوانی مەلای جزیری یان خوێندبێتەوە بەوردی ئاگاداری شیعرەکانی دەبن بەڵام من لێرەدا مەبەستم ئەوەیە فەقێ تەیران وەکوو بووە وژیاوە بەگەلی کورد بناسێنم.

"فەقێ تەیران کێ بوو"

لەکوردستانی چوارسەت ساڵ لەمەوبەر کە هەر ئاغا و میرێک لە بەشێکی وڵاتەکەماندا بۆخۆی کوێخاوگزیرو وەزیر و ئاڵاوتەپڵ وبەیداخ وکۆشک و سەراودیوەخان وخوڵام وکەنیزو نۆکەرودەست وپێوەندوسپا و لەشکروحوکمی هەبوو ودەماری وەرزێر وجووتیارو کاسبکاری کوردیان دەرهێنابوو.

خانی بدلیس خەریکی سازکردنی حەمام وکۆشک وسەرا بوو.

میرانی وان ومەرعەش و خەرپووت وبۆتان وفارس و باقی مەڵبەندەکانی کوردستان هەریەکە خوونکارێک بوون و خوێنی هەژارانیان دەمشت.

بەبیانووی جۆربەجۆر زێڕو پووڵیان لێ دەستاندن وبۆ دەرباری خاوەن شکۆی عوسمانییان دەنارد.

لەمکاتەدا شاعیرێکی گەورە ومەزن لەکوردستان پەیدا بوو کەبە شیعرو تارو تەنبووری خۆی خەوی خۆشی لەچاوی زڕاندن وخەڵکی چەوساوە وبێ دەرەتانی هاندا تا قەڵاوبارخانەوبەندیخانەی ئاغاوات ودەرەبەگ و میران تێک بڕمێنن.

ئەم شاعیرە **ناوی مەلا محەممەد خەڵکی حەکاری بوو. جالەبەر ئەوەی نەیناسن ناوی نەهێنی بۆخۆی دانا و بە (م.ح) یانی (محەممەد حەکاری) ناوی دەرکرد.**

خوالێ خۆشبوو محەممەد ئەمین زەکی بەگ لەبارەیدا نووسیوەتی:

**فەقێ تەیران خەڵکی ماکۆیە و لەنێوان ساڵەکانی ٧٠٧ ی کۆچی (١٣٠٧ - ١٣٠٨ی)میلادی ژیاوە ونازناوی م.ح بووە و ناوی راستی محەممەدە ولە دوو کتێبی بەناوبانگی حیکایەتی شێخی سەنعان و بەیتی ئەسپی رەش زیاتر زۆری شیعر نیە. شیعرەکانی سروشتێکی تایبەتی ناوچەی خۆیان هەیە.**

مامۆستای رەحمەتی **عەلائەدین سەجادیش لە "مێژووی ئەدەبی کورد"دا** هەر بەم چەشنەی نووسیوە.

مامۆستا **"بلەچ شێرکۆ"** ش وەکوو ئەوان باسی کردووە و ناوەکەشی بە مەحموود زانیوە

**دوکتۆر عێزەدین مستەفا رەسووڵ دەنووسێ" لە ئەنسیکلۆپێدیای ئیسلامیدا" کوردناس ئەلکساندر ژابا نووسیویەتی (محەممەد فەقێ تەیران ٧٠٢ هـ ١٣٠٢- ١٣٠٣ ی، میلادی ٧٧٧ هـ ١٣٧٥- ١٣٧٦، میلادی شیعرەکانی بەناوی م.ح بڵاو کردۆتەوە .....**

**لە (مکس)ی تورکیا لەدایک بووە. بەسەرهاتی** (شێخی سەنعان"، "حەکایەتی پڵینگ"، "بەیتی ئەسپی رەش"ی نووسیوە.

**دوکتۆر کەماڵ فوئادو مارگرێت رۆدنکۆ و عەبد و رەقیب یۆسف و... لەبارەی فەقێدا زۆریان تەحقیق کردووە ونووسیویانە کە لە. تێک کردنەوەی ئەوانە وادەردەکەوێ فەقێ ناوی** (محەممەد حەکاری" **بووە بەڵام بۆچی گوتوویانە تەیران هێندێک دەڵێن چونکوو لە بەیتی ئەسپی رەش بەزمانی باڵندە وحەیوان دواوە ولە راستیدا کەلکی لە (منطق**

الطیر)ی عەتاری نیشابووری وەرگرتووە ،خەڵکی ساویلکە وایان زانیوە کە ئەوە زمانی باڵندە وتەیران دەزانێ بۆیە پێیان گوتووە (فەقێ تەیران)

بەڵام مامۆستا عەبد و رەقیب یۆسف دەنووسێ کە فەقێ خەڵکی گوندی تەیران بووە کە دەکەوێتە نێوان مکس وهیزانەوە .

شیعری فەقێ تەیران

هێندێک لەشیعرەکانی فەقێ تەیران لە دەفتەرێکدا بەناوی گوڵ بەهار کۆکراوە ـ تەوە و ساڵی ۱۵۹۷ لە (یەریڤان) چاپکراوەوئەرکی چاپ وکۆکردنەوەی بەستۆی مامۆستا ئارامێ چاچان بووە .

لەشیعری فەقێ دا ئەو راستی یە دەردەکەوێ کە فەقێ تەیران یەکەم شاعیری شۆرشگێر وبناغەدانەری شیعری سیاسی لە کوردستاندایە بۆ وێنە چەند نموونە لە شیعرەکانی دێنمەوە تا بزانین چۆن دژی میرراوەستاوە

ئەز ناچم دیوانێ میرا
نابمشا روورێ کۆشک وسەرا
برامن خەن کێرو خەنجەرا
فەقی تەیراتەنگە زارێ دلا
گوشتێ من راکەن بەماشا
ل من خەن تیرو کەڤانا
ناچم دیوانێ میرو حاکما
فەقی تەیرا رەبەنێ دلا
هەبوونە دەنگ بێژوشاعیر
بەرووح ودلڤا پر فەقیر
میرو بەگلەرا سترانند
بێ قیمەت ومەلوول مانا

یانی : من ناچمە دیوانی میران نابم بە بولبولی کۆشک وسەرا ،باکێردوخەنجەرم لێ بدەن ،فەقێ تەیران تەنگە زاری دڵە . با گۆشتم بەمقاش لێ بکەنەوە . تیرو کەوانم لێ بدەن ،ناچمە دیوانی میروحاکمان ،فەقێ تەیران هەژاری دڵە .گۆرانی بێژوشاعیر هەبوون، بەرۆح و دڵ زۆر فەقیر، بۆمیروبەگ گۆرانی یان گوتووە ........ بەبێ نرخ ومەلوول ماونەوە..

لەوشیعرەی خوارەوەش وادەردەکەوێ فەقێ لەبەند کراوە ودەفتەرودیوانەکەی ونجر ونجر کراوە چون دەڵێ :

فەقێ گرتن زیندانێدا وەرکرن
قەلەمودەفتەر دەست گرتن
ئەوحەفسێ دا هەسیروژارکرن
فەقیێ تەیراتەنگ زار کرن

یانی :فەقێ یان گرت و خستیانە زیندانەوە. قەڵەم و دەفتەریان ئەستاند . لە بەندیخانە دایە بەخسیر و هەژاریان کرد .فەقێ تەیرا ـ نیان تەنگەزار کرد....

ئەمجار کورەمیریش دەچن و فەقێ جزیا دەدەن:

کورنێت میرپرخە ددارن
زیندان بونا نەفسێ ژارن
ئەز مردنێ ناکەم فکار
ئازایی دخازم هەر جار

یانی : کورانی میر زۆر غەددارن ،زیندانیان بۆ خەڵکی هەژار داناوە . من لە دەست مردن ناناڵم . هەموو دەمێ ئازادیم دەوێ .....

هەرلەوکاتەدا دەنگی دەگاتە گوێی خەڵک،دەڵێ :

دەنگێ من نولا بروسکائەورا
وی هەربێژە هەموو جێ یا
هەتانی ببی دەنگێ مفتەخۆرا
ئەزێ بستریمب تێل وتەمبوورا
هەگەرل سەرگوونی هەگەر زیندان دا
ئەزێ بێژمە جەماعەتا خودا

/

تێبینی :

بێجگە لەو شیعرانەی کە لە "مەموزینی خانی" و "دیوانی مەلای جزیری" وەرگیراون ، زوربەی شیعرەکانی ئەم وتارە لەباری وشە و وەزن وقافیەوە هەڵەیان تێ کەوتووە .

ئێمە داوامان لە نووسەری وتارەکە کرد تا ئەگەر بۆی دەلوێ ، ساغیان بکاتەوە. بەڵام چونکە تەنیا نوسخەیەکی بەدەستەوە بوو ، بۆی نەکرا ئەمکارە بێک بێنێ . ناچار ئێمەش دەستمان لێ نەدا .

"سروە"

**بەسەبکشیین نیرێ زولمکارا**
**هوون فکارانە کەن قەید و**
**چیدارا**
**هەتانە کەنگێ ئەزێ بێژم**
**ئاوا**
**قەلەم ژی هەلیای دەستێ**
**من دا**
**ئەزێ هەرم ناڤا کوردا**
**ئەزێ وان راسبیرم ئازایە**
**ئەڤە گوتنا منە هەتا**
**هەتایە**

یانی: دەنگی مروەک گرمژەنی هەور دێ ودەڕوا، سەرلەهەموو جێ یەک دەدا، تا دەنگی مفتەحۆران مابێ، من بەتاروتەمبوور گۆرانی حۆم دەڵێم، دەڵێم بەسە نیری بەخسری لەستۆ دارن، ئێوە لە دەسکۆت و زنجیر هاوار مەکەن، هەتاکەی من ئەوە بڵێم. قەڵەمیش بەدەست منە. من دەچمە نێوخەڵک. من گۆرانی ئازادی دەڵێم. ئەوە قسەی منە هەتا هەتایە .....

بەراستی شیعری ئەمڕۆی کوردی وشیعری رابردوو بە بڕوای من هەتا هەتایە بەرمەتی فەقێ تەیرانە. هیچ دوورنیە فەقێ و شیعری شۆڕشگێڕانەی ئەو، ئەحمەدی خانی هان دابێ تا مەم و زین دانێ وەک دەڵێ:

**من دێ عەلەما کەلامێ**
**مەوزوون**
**عالی بکرا ل بانێ گەر**
**- دوون**
**بیناڤە روحا مەلێ**
**جەزیری**
**پی حەی بکرا عەلی**
**حەریری**
**کەیفەک وەبدا فەقیهێ**
**تەیران**
**حەتتا بئەبەد بمایە**
**حەیران**

ئەمە ئیقراری ئەحمەدی خانی بوو. جابێ گومان ئەگەر فەقێ نەبووبا شیعری شۆڕشگێڕی کورد بەم زووانە لەدایک نەدەبوو و شاعیری وەکوو خانی وحاجی قادر و مەلای گەورە وپیرەمێردوبێکەس و گۆرانیشمان نەدەبوو. ئەگەریش ببوایە هەرئەوانە بوون کە شیعروهەستی خۆیان بکەنە قوربانی بسکی کچۆڵان وبەژنی رێک وپێک وچاوی بەڵەک ... بەڵام ئەمە لە کوێ وئەوە لەکوێ ...

وەکوو لەپێشدا گوتمان **فەقێ تەیران دووکتێبی نووسیوە بەڵام سەبارەت بە (شێخی سەنعان) جێگای گومانە وچەند کەسلەزانایان پێیان وایە کە ئەوە ئی فەقێ نیە، بەڵام چیرۆکێک بە ناوی (نەوالەی سیسەبان)ی هەیە بۆیە بەڕای من ئەرکی زانا و موحەقیقی کوردە کەلەبارەی فەقێ وشوێنەوارەکانی زیاتر بنووسن وزیاتری بناسێنن .**

---

**پاشماوەی دایک ....**

"ئەمەکوڕی چووکەیەتی" یەک دەیگوت:

"نەورۆزی لێ بوو بە ژەهری مار"و ... منیش دەستم کرد بەگریان ولە خۆدان و هاوارکردن ... کەلەنەکاو دایکم گوتی:

- رۆڵە، رۆڵە هەستە، ئەوە بەیانی یە، درەنگە یەکەمین رۆژی ساڵە، ئێستا میوانمان بەسەر وەردەبن ... دادەی! ئەوە چیە ئەیەڕۆ بۆچی دەگری؟ منیش کەخەوم لەچاوی پەڕی بوو، کاتێک دایکم دیت پەلامارمدا وماچم کردوگوتم دایەگیان تۆم زۆرخۆش دەوێ، توخوا قەت مەمرە، دایکیشم کەسەری سوڕمابوو گوتی:

- باشەکوڕم هەستە درەنگە ئەوقسانە چن؟ نابینی زەق و زیندووم. لەمکاتەدا مامۆستا گوتی:

- دەفتەرەکەت بێنە ئەحمەدی، دەبێ سیفرێکت بدەمێ بەقەدەر سەری خۆت واتلێ هات گاڵتەمان پێ دەکەی؟

دەفتەرەکەم لەسەر میزەکەی دانا، کە چاوی پێکەوت سەری سووڕما نەیزانی بڵێ چی.

دەزانن بۆ؟ لەبەرئەوەی کە هیچی تێدا نەنووسرابوو!

ئاوڕێک لە
وەسەرمێشرووی کوردستان

# گەڕانەوەی
# دەهەزار یۆنانی

بەرامبەر ئەم شوێنە کە دۆزیبوویانەوەکێوەکانی ئەرمەنستان دیار بوون کە بە لێژاییەکی زۆر رژدەوە ، بەرەو چۆمەکە کشابوون . ئەگەر لەشکری ئێمە لەم شوێنە لەئاوی دابا وپەڕیباوە سوارەی دوژمن لەبەر کوێستانە لێژەکانی پشت سەری هیچی لەدەست نەدەهات .

لەگەڵ دوولاوەکە جۆرە شەرابێکمان پەیدا کرد و سپاسی خودایانمان بەجێ هاوردوولامان لە خێری سوفوس نارد . ئەویش هەرکە ئەم هەواڵەی بیست فەرمانی دا بارگەوبنە تێک نێن وئامادەی رۆیشتن بن .ئێمەی سەرکردەش کۆبووینەوە ودەربارەی کارەکان وئەرکی خۆمان کەوتینە راوێژ .

قەول وقەرارمان ئاوا

ع . بەمەدی

دانا که خئری سوفوس به خۆی وبه لایەکی لەشکرەوە سەڵتەزین له ئاوەکە بدەن پاشان که پەڕینەوە بارگە و بنەیان بەدوودا بنێرن . منیش لەم بەرە بمێنمەوە وئاگام له کوردان بێ .

بۆبەجێ هێنانی ئەم تەگبیرە دەبوایە لەئۆردوگاوە بەرەو بەستێنی چۆم وەڕێ بکەوین کە هەشسەت هەنگاوێک دەبوو .هەرئەوەندە وەڕێ کەوتین ،سوارەی دوژمنیش لەوبەری چۆم وەڕێ کەوت . کە گەیشتینە سەر ئەو بوارەی کە لاوەکان دۆزیبوو- یانەوە راوەستایین ، سەربازەکان چەکەکانیان لە سەریەک هەڵچنی .ئەو دەم کاهین داب ودەستووری ، ئایینی یان بەجێ هێنا وبۆ خێوی چۆمی کنتریس قوربانی یان کرد .

خئری سوفوسیش لەم رەسمەدا تانجەگوڵێکی لەسەر نابوو وساقۆی سواری وەلا نابوو . سەربازەکان تێیان هەڵکردە سروودی شەڕ وپێشەنگ دابڕ دابڕ بوو و وەنێو ئاو کەوت .خئری سوفوسیشیان لەگەڵ بوو . هەر ئەوەندە خئری سوفوس بەنێوەی لەشکرەوە لەئاوەکەی دا ئاراکانم رەگەڵ خۆخست وبە دەمئاوەکەدا بۆلای خوارووم ئاژۆ ت .سوارەی دوژمن کە چاوی بەمەکەوت وای زانی کە خئری سوفوس لەلایەکەوە ومنیش لەلایەکی ترەوە گەرەکمانە لەنێو خۆمانی بگرین ، بە ناچاری پیادەنیزامی بەجێ هێشت وهەڵات .

خئری سوفوس کە بە سلامەت پەڕیبووەوە وەدوای سوارەکان نەکەوت ،جڵەوی وەرگێڕا وهەڵیکوتایە سەر پیادەکان .ئەوانیش کەبەبێ سوارە مابوونەوە زانییان کەبە تەنیا پیاوی شەڕ نین ودەرەقەتی لەشکری یۆنان نایەن ،ناچار لەلاقانییان وەرێناو رزگاری یان هات .

تائێرە هەموو شتێک بەدڵی ئێمە بوو .بەڵام هێشتا پاشەنگی لەشکر کە لەژێر فەرمانی مندابوو لەوبەری چۆم مابۆوە و مەترسی پەلاماری کوردەکانیان لێ دەکرا . هەر ئەوەندە توانیبامان پشت لەکوردەکان بکەین ولەئاو بدەین بەسمان بوو ،بەڵام ئەوانیش هەر چاوەڕوانی ئەمهەلە بوون .

من بە لەشکرەوە لە لای کوردەکان بەجێ مابووم و دەبوو بوارێک بدۆزمەوە بەبێ ئەوەی پشت لەچیا بکەم! لەئاکامدا لەشکرەکەم کردە دووبەش وبەشێکم دەس بە چەکەوە رووبەکوردەکان دامەزراند و بەشەکەی تریش بە ئەرخەیانی وبەبارگە و بنەوە لە ئاویان داو پەڕینەوە .

کوردەکان کە دیتیان لایەکی لەشکر پەڕیوەتەوە و دەستەیەکی کەمبەجێ ماوە ئەوەیان بەدەرفەت زانی و بە گوڕڕە وهەڵڵا وسروودخوێند -نەوە لەچیاکان داگەڕان و هێرشیان بۆهینایین .خئری سوفوس بەلەز کەواندار و قەڵماسک دارەکانی خۆی رەوانە کرد تاکوو لە پەڕینەوەدا یارمەتیمان بدەن .

فەرمانمدا کەواندارەکان لەوبەر راوەستن وکە ئێمە لەئاومان دا دەست بە تیرهاویشتن بکەن .ئەمجار بێ سێ ودوو هەڵمانکوتا سەر کوردەکان وراومانان،لەگەڵ دەنگی شەیپوورەکان بەرز بۆوە لەنیوەڕێ جڵەومان وەرگێڕا وگورجێک گەڕاینەوە وخۆمان بەچۆم دادا .

کوردەکان بە وەخت نەگەڕانەوە وبەهەڵە چوون ، چون لە دەنگی شەیپوور دەگەیشتن ،دەیانزانی نیشانەی هێرشە نەک پاشەکشە . بەڵام درەنگیان بەدەهۆی ئێمە زانی چونکوو ئیتر چی وا نەمابوو بپەڕینەوە و لە پەنای کەواندارەکانی خۆشماندا بووین .

بەمجۆرە بەسلامەتی خۆمان گەیاندە ئەرمەنستان . وئەم تەلەسمەمان شکاند .

تەواو

بەشی یەکەمی ئەم وتارە لە سروەی ژمارە ٦دا چاپکرا . ئەوە بەشی دووەمی لەم ژمارەدا پێشکەش دەکرێ . داوا لە خوێنەرانی بەرێز دەکەین لەم بارەوە یارمەتیمان بدەن بەڵکوو بتوانین " بەشی دەنگ لە زمانی کوردیدا " پوختەتر بکەین .

٢- دەنگی باڵندەی دەستەمۆ و کێوی

لەگلەگ = دەتەقێنێ ( تەقاندن ، تەقە )
مریشک = دەقرتێنێ ( قرتاندن ،قرتە )دەکورکێنێ (کورکاندن ، کورکە)- دەگارێنێ ( گاراندن ، گارە گار )
کەڵەباب = دەقووقێنێ ( قووقە )
کەو = دەقاسپێنێ ( قاسپە ) ،دەغوڕێنێ (غوڕە )
چۆلەکە = دەجیکێنێ ( جیکاندن ، جیکە )
جووچکە = دە جریوێنێ ( جریواندن ، جریوە) دەجرووکێنێ ( جرووکاندن ، جرووکە )
کۆتر = دەگمێنێ (گماندن، گمە )
قەل = دەقڕێنێ (قڕاندن، قڕە )
مراوی = دەقاڕێنێ (قاڕاندن قاڕە )
بولبول = دەچریکێنێ ( چریکاندن ،چریکە )
زیق زیقاوە= دەزیقێنێ (زیقاندن زیقە )

قشقەڵە = دەقڕێنێ (قڕاندن، قڕە )
بێجگە لەوانە باڵی چەند باڵندەی وەک هەڵۆ ودالاش(داڵ) هاشە وهازە وهاژەی دێ .

٣- دەنگی گیان لەبەر و زیندەوەری بێ زەرەر و ..... بەزەر :
مێش = دەوزێنێ (وزاندن،وزە ) دەویزێنێ (ویزاندن، ویزە )
زەرگەتەومێش هەنگوین دەهازێنێ (هازاندن ، هازە ) دەگیزێنێ ( گیزە )
ژەنگەسوورە = دەوژێنێ ( وژاندن ، وژە )
سریلە (سیسرە )= دەسیڕێنێ ( سیڕاندن ، سیڕە )
مار = دەکوڕێنێ (کوڕاندن ، کوڕە )دە وشێنێ( وشاندن، وشە) دەهاشێنێ ( هاشاندن، هاشە ) دەهووشێنێ (هووشاندن ،هووشە )
بۆق = دەقڕێنێ (قڕاندن،قڕە ) دەقیڕێنێ(قیڕاندن ، قیڕە )
کیسەڵ = دە وشێنی ( وشاندن، وشە )

٤- دەنگی ئینسان :

پیاو= دەنەڕێنێ (نەڕاندن ، نەڕە ) دەگوڕێنێ( گوڕاندن ، گوڕە ، گوڕژن)
ژن = دەشریخێنێ (شریخاندن شریخە )دەزیقێنێ(زیقاندن ،

زیقە )
مندالّ = دەنووزێنێ (نووزاندن
نووزە ) دەزیقێنێ ( زیقاندن
زیقە ) دەکۆخی (کۆخە ) دەپشمێ
(پشمە ) . . . دەشیڕێنێ (شیڕاندن
شیڕە ) دەفیڕێنێ (فیڕاندن
فیڕە ) ئەوفیڕاندن وشیڕاندنە
لەنێو گیان لەبەرانی
دیکەشدا دەبیندرێ .
دەجیقێنێ = (جیقاندن ،جیقە )
دەنالێنێ (نالاندن ، نالە )
دەنارێنێ = ( نارە نار )
دەبۆلێنێ = ( بۆلاندن ، بۆلە
بۆلژن )
دەقلخێنێ = (قلخاندن ،قلخە )
دەقرخێنێ = (قرخاندن ، قرخە )
دەفرمێنێ = (فرماندن ، فرمە )
دەفیکێنێ = (فیکاندن ، فیکە )
٥ـ دەنگی ئەوشتانەی لە
تەبیعەتدا هەن :
هەور = دەگرمێنێ (گرماندن ،
گرمە ، گرمژن ) دەشریخێنێ
( شریخاندن ، شریخە )
باران = خرمەی دێ (خرمە ،
خرمژن )
با = هاشەی دێ ( هاشاندن
هاشە ) دەوزێنێ (وزاندن ، وزە )
ویزەی دێ (ویزاندن ، ویزە )
هاژەی دێ (هاژاندن ، هاژە )
سەماوەر = هازەی دێ (هازاندن ،
هازە )
گوللە = هازەی دێ (هازاندن ،
هازە ) .
ئاو = خوڕەی دێ ( خوڕاندن ،
خوڕە ، خوڕڕە )
ئاور = لرفەی دێ (لرفاندن
لرفە )
دار = خشەی دێ ( خشاندن ،خشە )
جیڕەی دێ (جیڕاندن ،جیڕە )
بەرد = تەقەی دێ (تەقاندن ،
تەقە ) شەقەی دێ (شەقە )
( هەڵبەت شەقە وتەقە
مانا یەکیان هەیە . )
سیڕەی دێ (سیڕاندن ، سیڕە )
ددان = کرڕەی دێ (کڕاندن ،کڕە )
دیوار ـ جەوالّ ـ بەڕە = تەپەی
دێ (تەپە )
دلّ = کوتەکوتێتی ـ کوتەی دێ
( کوتان ، کوتە )
چرا = پتەی دێ (پتە ،پتەپتێتی )
مەنجەڵی مس = زرینگەی دێ
(زرینگانەوە ،زرینگە )
جەڕڕەوگۆزەی گلّ = زرینگەی
دێ (زرینگانەوە ،زرینگە )
عەرز ـ هەرد = زرمەی دێ
( زرمە )
مەزرەق = وینگەی دێ (وینگە )
شمشالّ = تووڕەی دێ (تووڕە )

## فۆلکلۆری کوردی

# میرپەنج

دەلۆلۆ . . . ئاخ دەلۆلۆ . . . میر پەنجۆلۆلۆ

ـ میر پەنجۆ وەزێ ب بێلانا قەلەنییێ داکەتم هابدارە . . .

ـ دار جغارا دەستێ تاهر خانێ منی برا کەکێ "زەزێ" باڤێ "جەمیلێ" شیلانەمادنا سەری کاریبارە . . .

ـ دە ئیرۆ پێرا ل سەر سمبێلێ میر پەنجێ منی برا هاب کارئووبارە . . .

دەدبێ "زەزێ" ل بورجا بەلەک دسەکنی بسی دەنگا دکر گازی دگوت تاهر خانۆ ل خەوا شرین رابە سەرا ئێل و عەشیرەتا خو بدە .

ـ ئەسکەرێ تەیموور خانی ماکوویێ عەجەم پێنج هەزارە . . .

ـ ئەسکەرێ برایێ تە هندکە پێ نکارە . . .

دەلۆلۆ . . .

ـ میر پەنجۆ برا وەزێ ل بێلانێ قەلەنییێ داکەتم وێ ب هێل و مێلە . . .

سمبێلێ تاهر خانێ منی برا بینانی هەڤرمووشێ بەر دەستێ وان بەزازا بەعلبەکێ دفرۆشن تێل ب تێلە . . .

وەزێ ب دیارێ قەلەنییێ داکەتم سرا سارە

دار جغارا دەستێ کەکێ "ژەزێ" شیلانەتاخما سێری کاریبارە . . .

پێنج هەزارە ئەسکەرێ تەیموور خانێ ماکوویێ عەجەم هاتییە سەر کەکێ من ماروومێ ئیشەڤ ئێڤاردا دکە ناکە پێ نکارە . . .

دەلۆلۆ . . . ئاخ دەلۆلۆ . . .

ئاغایۆ دە تو بەردێ، ماقوولۆ دە تو بەردێ

پێشییا ئەسکەر داکەتییە قرخبلاغێ، پاشی مایە دێرزا کەلەفێ عەباسکەندێ . . .

''''' ڕەسووڵ وەیسی

لە کوردستان هەرکە خەلەو خەرمان هەڵگیران و پا یز رووی لە زستان نا ، دووکەڵ لە دووکێش و کولانان وەدەر دەکەوێ،خاووخێزان دەورە لە کورسی دەنگێون.

هەرکە رۆژ هەڵکشا تا ماڵ خەوتنان دەروجیران لە ماڵی یەکتر کۆ دەبنەوە و کای‌کۆن بەبا دەکەن و نەقڵ ونەزیلە دەگێڕنەوە و مەتەڵۆکە لە یەکتر دادێنن و حیکایەت دەکەن و وا هەیە گوتنیش بلێین.با سەرێک لە ماڵی خاڵ چەتۆ بدەین و بزانین باس و خەبەری ئەوێ چیە .

خاڵ چەتۆ پیاوێکی خڕیلە و بەدڵ و دەروونە بەڵام کەللە رەقە ،خاوەنی سێ کوڕ و دوو کچانە .دوو کوڕی بەژن و ماڵن ، کچێکیشی لە ماڵی‌مێردە. خاڵ چەتۆ لەگەڵ ژنێک و کوڕو کچێک دەژی.کە دەرگای ژووریان دەکەینەوە تەماشا دەکەین ئەوا خاڵ چەتۆ لەگەڵ هەباسە تەپلەی دراوسێ - یان و ژن و منداڵی،لەبن کورسی دانیشتوون.خاڵ‌چەتۆی تەنگە ئەستوور کە لایەکی کورسی داگیر کردووە و ژوورەکەی بە دووکەڵی جگەرە قانگ داوەوپاڵتۆشڕەکەی بە شانیداداوە روو دەکاتە هەباسە تەپلە :

- بەسەری تۆ خاڵ هەباس ماڵمان لە"سەر گردە" بوو ، باوکم بەرەحمەت بێ لەگەڵ مردووی تۆ ،هێشتا خەتی سمێڵم نەدابوو،تەمەنم هەر چاردە پازدە دەبوو، ئەو ژنەی حازری،خەجێی بۆم لە سۆفی تەهای رەحمەتی خواست و ئەویش زۆر پیاوانە پێشکەشی باوکمی کرد.یا ڕەبی بەرەحمەت بێ،بەخوای بابە پیاوی چا بوو. پیاوەتی هەر بەلایەک نەدەکرا باوکیشم عەیشەی خوشکمی دا بە کوڕەکەی و پێکەوە بووینە خزم.بابە ئەو پیاوەتی ئەو زەمانی هەبوو کوا ئێستا ماوە؟

هەباسەتەپلە قسەکەی دەبڕێ و دەڵێ:

- کوڕە حا ڕێ لەو قسانە گەڕێ! تازە لەمن و لەتۆ رابردووە با چارەیەک بۆ مامخدر بدۆزینەوە،کە لەوەتا پارەکە ژنەکەی ئەمری خوای کردووە بێ سەوان ماوەتەوە

خاڵ چەتۆ :

- وەڵڵاهی خۆ راست‌دەکەی بەڵام خدر خۆ کچی نیە بۆ خۆی

ژن بە ژنەی پێ بکا .

خاڵ چەتۆ: باشە کەسی دیوەتەوە ؟

هەباسە تەپلە: وەڵڵاهی چت لێ وەشێرم ئەوەی راستی بێ منی کردۆتە قاسید بێمە خزمەتت ئەگەر رەزات لێ بێ ئەوە فاتمی کچت بدەین بەو، برازاکەی ئەویش لە ئەحمەدی کوڕت مارە بکەین.

چەتۆ: ئاخر هەباس کوا فاتم بۆ خدر دەبێ؟ ئەو زۆر بەتەمەنترە.

هەباسەتەپلە: کوڕە ئەگەر بۆخۆت پێت خۆش بێ زۆر چاک دەبێ. مام خدریش کەسی لەگەڵ دەماڵدا نیە و زۆر باش رێک دەکەون.

چەتۆ مژێک لە جگەرەکەی دەدا و دەکەوێتە فکر و خەیاڵان. پاشان ئەملاوئەولابەک دەکا و پاڵتۆکە بە شانیدا دەداتەوە:

ـ وەڵڵاهی هەباس جونکوو بە ردێنی سپیەوە زەحمەتت کێشاوە هاتویە و مامخدریش پیاوێکی فەقیروخوانا سە قەیدی نیە لەگەڵ ئەو کچەشم نەکرد و کردمە پێوەکەوشێک و لەپێی توم کرد.

خەجێی خێزانی خاڵ چەتۆکە ئەم قسانەی بەدڵ نەبوون هەر ددانی گر دەکردنەوە، لەپڕ گوتی:

ئەرێ خاڵ هەباس حا کوا فاتمیلێ بۆ ئەو پیاوە پیرە دەبێ، پێم وایە ئەویش کەسی لەئێمە زیاتر وەگیر نەکەوتووە راست هاتووە لە داوێنی ئێمە هاڵاوە.

چەتۆ لە دەمی خەجێ دەداتەوە و دەڵێ:

ـ کچێ خەج تۆ بێدەنگ بە، هەقت بەو کارانە نەبێ قسە لە قسەی پیاوان مەکە!

هەباسە تەپلە بۆ ئەوەی لەمە زیاتر گوێی لە قسەکانی خەجێ نەبێ روو لە چەتۆ دەکا دەڵێ:

ـ ئەدی خاڵ چەتۆ ژن بە ژنەکەی ماڵی دەروێش برایم وشەنگە چی لێهاتەوە، هیچ دەنگی نیە؟

چەتۆ: بڵێم چی برالە

گوایە کچەکەی دەروێش برایم بە کوڕەکەی شەنگە رازی نیە هەروا ماوەتەوە.

هەباسە تەپلە بۆ ئەوەی چەتۆ باشتر هان بدا دەڵێ:

جاچۆن کچەکە رازی نیە! وەڵڵا وەبیلا ئەگەر ئەوە کچی من بوایە و لە قسەم دەرچووبایە بە شەنە ورگم دەدڕێ! بابە کچی ئەو زەمانە حەیایان لە روو هەڵگیراوە.

خەجێ کە لەنێو خەڵکدا بە خەجەهەیتە ناوی دەرکرد ـ بوو هەر دەتگوت قسەی لە باخەڵدان،گورج لاتاوێکی دیکەی بە بنانگوێی هەباسە تەپلە دادا و گوتی:

ـ خاڵ هەباس دەروێش برایم بۆیە ئەم کارەی نەکردووە کە دێ دوختەری لێ نیە لەوە ترساوە نەوەکوو کچەکەی بە شەنە بمرێ، وەڵڵاهی هەر ئەوە مابوو فێری چەتۆ بکەی، ئەوە کچی خۆت بوایە قەت ئاوات نەدەگوت کوڕە چەتۆ، ئەوە خەرفاوی یا خوا لێ گۆڕیوی؟ بۆ لەم دنیا پان و بەرینەدا

کەس نەماوە کچی بدەیەی، ئەو پیرە پەندە نەبێ؟ فاتمیش کە هەر لە هەوەڵەوە لە دووری کورسی، لە پەنا کوڵەکە هەڵترووشکابوو گوێی بۆ قسەکانی باوکی و هەباسە تەپلە شل کردبوو فرمێسکی هەڵدەڕشت دەنگی لێنەدەهات

چەتۆ کە پرتەوبۆڵەی خەجێ و گریانی فاتمی پێ خۆش نەبوو لەپڕ دارجگەرەیەک دەخێوێنێتە پشت ملی خەجێ و بەسەریاندا دەگوڕێنێ: هەستن لەبەر چاوم لاچن، من ئەم کارە دەکەم ئێوەش هەر خۆتان هەڵباوێن و بلێن هەیدەرین قەلەندرین، بە پشوو هەڵماڵاوی روو لە هەباسە تەپلە دەکا و دەڵێ: هەباس بەمام خدر بلێ ئەوە من کچەکەی خۆم دایەو با ئەویش ئەدارەک بۆ برازاکەی خۆی بگرێ، لەدێی خۆشمان مەلا نیە با مامۆستا مەلا بایز لە.......را بێنێ و هەر سبەینێ جێبەجێ بکەین.

مام خدر کە باوەڕی نەدەکرد کارەکە ئاوا زوو پێک بێ خێرا هەموو شتێک حازر دەکا و مامۆستا مەلا

بایز دێنێ و بۆ مارەکردن لە ماڵی هەباسە تەپلە کۆ دەبنەوە. مامۆستا سەرپێتی قسان خۆش دەکا و دەڵێ:

- دەی براینە با بزانین چۆن پێک هاتوون وقسە - کانتان چۆن بڕیوەتەوە.

هەباسەتەپلە کە وەکیلایەتی هەردوولای بەستۆوە بوو وەدەنگ هات و گوتی:

- جا مامۆستاپێکهاتنەکە چۆنە؟ خاڵ چەتۆ کچەی خۆی داوەتە مام خدر و مامخدریش برازاکەی داوەتە کوڕەکەی خاڵ چەتۆ. ئێستاش تەنیا مارە کردنە کە ماوە کە ئەویش بەعۆدەی جەنابتە.

مامۆستا: هەردووک لا رازین؟

چەتۆ: بەڵی رازین. رازی نابن دەڵێن چی؟

مامۆستا: زۆر باشە ئەدی کچەکان لە کوێن؟ با وەکیلایەتیان لێ وەرگرین.

چەتۆ: جەنابی مامۆستا وەختایەکی باوک و مام لە حزوور دابن کچەکان چۆن دەتوانن بێنە ئێرە؟ دڵنیا بە هەموو رازین، خۆ ئیشەڵڵا ئێمە درۆ ناکەین!

* * *

بە کورتی کردیانە ریس و گوریسێک سەریان لە مەلا و حازریان شێواند، وایان نواند کە کەس نارازی نیە. مەلاش کاری تەواو کرد و زەماوەندی نابەدڵ سەریگرت.

ساڵ ونیوێک بەسەر ژن بە ژنەدا رابرد، خدر و فاتم هەر چەند خاوەنی منداڵێک بوون بەڵام جیاوازی تەمەن کوسپێکی گرانی خستبووە سەر رێگای ژیانی خدری پەنجاساڵە و فاتمی نۆزدە بیست ساڵانە. خدر پیر بوو و رۆژ بە رۆژ ئەخلاقی دەگۆڕا و فاتمیش هیچ دڵی بە ماڵ خۆش نەبوو. پێکەوە نەدەسازان. ئاخر و عاقیبەتی ناعیلاج دەبن تەڵاق بە تەڵاق بکەن.

ئەرێ خزمینە لەمنێوەدا! کێ فیدا بوو؟ تەنێ کۆرپەیەکی بێتاوان یا ....؟

پێوە = لینگە، تا

خێواندن = لێدان

، داهێنانی زەبر

# بار هێنانی منداڵ

وەختێک منداڵ بزۆزی دەکا وناسرەوێ ،ئەگەر ئێمە بزچاوانمان گرژ بکەین و بەسەریدا بگوڕێنین :هەتیوە هەدادە! "،یا وەختێک لەیستۆکەکەی دەشکێنێ ، دەیسووتێنێ یا جل وبەرگی خۆی پیس دەکا ،ئەگەر ئێمە زللەیەکی پێداکێشین یا تفێک لەرووی بکوتین وبە گریان لەماڵ دەری بکەین کارێکی خاسمان نەکردووە .

نابێ لەیادمان بچێ کە "کایە" ژیانی منداڵە ونابێ لەبیری بکەین کە خۆشمان کاتی منداڵی ومێرمنداڵی کایەمان دەکرد ،شووشەمان دەشکاند ،سواری سەری یەکتر دەبووین و نەدەهەندراین .

بێ گومان لەبیرت نەچۆتەوە چەندەت خۆشارۆکێ کردووە . چەندجاران لەگەڵ منداڵی دراوسێ بەگژ یەکتردا چوون ودایکت بەدواتدا هاتووە و بەزۆر بردووتیەوە ماڵێ .

جاکە خۆمان ئاوا بووین بۆدەبێ ئێستا رەفتارمان لەگەڵ جگەرگۆشەمان ئاوابێ .

**یاری دنیای منداڵانە . منداڵ بەیاری زیندووە** **ژیانی** بەکایەوە خۆشگەرەکە . زۆرکەس دەڵێن : "منداڵ ماسی یە وکایە ئاو". ئەوی راست بێ ئەو زارۆکە (۲)ی یاری ناکاوخۆی لێ دەبوێرێ زوو هەڵنادا وزەینیشی وەپاش دەکەوێ ودەبێ تا زووە چارە بکرێ .**منداڵی ئاقڵ** ئەوە نیە کە دایمە لەگۆشەیەک بە بێدەنگی دابنیشێ ! بەداخەوە زوربەی دایک وباوکان تەنانەت موعەللیمەکانیش دەیانەوێ منداڵ هەمیشە ئارام وهێمن بێ .بەڵام دەبێ قەبووڵ بکەین کە منداڵ ناتوانێ بۆپێنج دەقیقەش لەسەرەخۆبێ ،ئارام بڕوا و هێدی بدوێ .منداڵ پێی ناکرێ هەمیشە جل وبەرگی خاوێن و پاکژ رابگرێ .کەوابوو ناتوانین پێشی کایەی منداڵ بگرین .بەڵام زۆر چاک دەتوانین کایەی منداڵ بۆ هەر لایەکی کە بمانەوێ لابدەین .زارۆک چلۆن یاری بکا ،لەپاشەرۆژیشدا بە زۆر باران بۆکاروباران وادەبێ .

**عاملاندنی مرۆی تێکۆشەر لەپێش هەموو شتێکدا پەیوەندی بەشێوەی یاری کردنی سەردەمی بچووکی یەوە هەیە . شەخسیەتی مرۆ لە تەکامولی کایەکانی وگواستنەوەی بەرە**

**بەرەی ئەوکایانە بۆمەیدانی کاروئاکار ،پێک دێ .**

ئەمەش بڵێین کە یاری و کار فەرقێکی فرەیان نیە . یاری باش وەک کاری باشە و یاری خراپ وەک کاری چەوت و نالەبارە .منداڵ چۆن فێری کاری باش یا خراپ دەبێ ، ئاواش فێری کایەی باش یا خراپ دەبێ .کایەی باش لە شوێنی چاک وبەلەیستۆکی (٣) باش دەکرێ .کایەی باش

زەینی منداڵ تیژدەکا . منداڵ تینووی دروستکردن وخوڵقاندنە ،جا بەهەرجۆرێک بۆی بلوێ . دەجا باشتر وایە ئامێروکەرەستەی ساکاری بخەینە بەردەست تا بتوانێ شتێکی باشتروگەورەتریان لێ پێک بێنێ .زۆرجاران بۆ منداڵێکی ژێر حەوت ساڵ،چەند موکەعەب ،لەفرۆکەیەکی بەرقی یا شەمەندەفەرێکی سەرسوورێن باشترە .باشی یا خراپی ئامرازی کایە ، بە گرانی یا هەرزانی قیمەتەکەی نیە ،گرینگ ئەمەیە: "چۆن بەکاردێ " .بۆئەم کارەش ، دایک وباوک زۆرباش دەتوانن یاریدەی منداڵەکەیان بدەن . ئەڵبەتە مەبەست ئەوەنیە کە دایک وباوک لە پێشدا خۆیان گەمە بە لەیستۆکەکە بکەن ،جاکە لێی وەڕەز بوون نۆرەی منداڵەکانیان بێ و فەرمانیان پێ بدەن کە ئاوا بکەن وئاوا مەکەن .

ئێمە دەڵێین ئەگەر منداڵەکەت خەریکی دروستکردنی گاریەیە وبزماری دەست ناکەوێ لێی گەڕێ با ئەوەندە بەشوێن بزماردا بگەڕێ تاخۆی لە چیلکە بزمار دروست دەکا .لێی گەڕێ با کۆتەرەیەکیش بکا بەئەسپەکەی. یا لە تەختەشپێچکەی بۆساز بکا .با بەردێکی لەباریش بدۆزێتەوە وبیکا بەکابرای داشقەچی .یانی چی گەرەکە باخۆی دروستی بکا . ئەرکی تۆ ئەمەیە هانی بدەی کارەکەی تەواو بکاونیوەچڵ بەجێی نەهێڵێ .جاکە ئەم منداڵە بەم چەشنە یاری بکا ئامادە دەبێ کەلەپاشەڕۆژدا ، شتی گەورە وگرینگ دروست بکا .

هێندێک دایک وباوک زۆرتر لەفکری ئەوەدان کەلەیستۆکی زۆرتر وسەر سوورێنتر وتەواو ئۆتۆماتیک بۆمنداڵیان بکرن. ئەگەر سەرلەماڵی ئەم جۆرە دایک وباوکانە بدەی ،تەماشا دەکەی وەک دووکانی لەیستۆکی منداڵانە هەموو شتێکی لێ پەیدا دەبێ و منداڵەکەشیان هەرتاونا تاوێک خۆبەشتێک دەخافڵێنێ و خێرا دەیشکێنێ و گەڕووی لەیستۆکێکی تر دەگرێ . بێ ئەوەی هیچ فێربێ یانی سەری لێ شێواوە . ئەمە کارێکی باش نیە. **لەیستۆکی زۆر سەر لەمنداڵ دەشێوێنێ .**

بێتوو ورچێکی قورمیشدار بۆ بچووکەکەت بکڕی،هەر لە بەیانی یەوە تا ئێوارە قورمیشی دەکاوبەرهەڵدای دەکا .ئەو رۆژە هەر سەیری دەکاو پێدەکەنێ . بەڵام ئەم یاری یە تێکۆشینی زەینی تێدا نیە .لەمنێوەدا منداڵەکە کەسێکی بێ کردەوەیە کە هیچ شتێکی دروست نەکردووەو کایەکەشی بێ بەرهەمە .

ئەگەر منداڵ هەمیشە

خەریکی ئەمجۆرە یاری یانە بێ ،یا تەنیا تەماشاکەرێک بێ لە دوارۆژدا دەبێتە مرۆیەکی بێ بەرهەم ،مرۆیەکی کەتەنیا تەماشاچی کاری خەڵکی ترە وناتوانێ شتێکی نوێ دروست بکا . ناشتوانێ گرێ وگرفتکی ژیانی خۆی بکاتەوە وبەسەر دژواریدا زاڵ بێ .

دایک وباوک وموعەللیم ومەدرەسە دەبێ بناغەی کایەی منداڵان بۆئەم ئامانجانە دابرێژن :

١- منداڵ دەبێ بەراستی یاری بکا ،دروست وداهێنەر بێ ورێکخراو ێک پێک بێنێ .

٢- منداڵ نابێ لە یاری یەکەوە بپەڕێتە سەر یاری یەکی دی .یانی دەبێ یاری یەک تەواو بکا ، ئەجار بچێتە سەر یەکی تر .

٣- منداڵ دەبێ لەکایەدا فێربێ چۆن دەبێ لەگەڵ ئاواڵەکانی بەتایبەتی ئاواڵی مەدرەسەی ،بجووڵێتەوە

٤- منداڵ دەبێ لەیاریدا فێربێ چلۆن لەگەڵ کەسی لە خۆی گەورەتر بجووڵێتەوە . یانی دەبێ فێربێ رێز لە گەوران بگرێ .

بەکورتی یاری تێکۆشانێکی سرشتی یە کە منداڵ بۆ ژیانی باشتر وخۆشتر تەیار دەکا .

ئەوەش بڵێین کە یاری جۆرە عاملاندنێکی کۆمەڵایەتی یە بەتایبەتی ئەو یاری یانەی کە منداڵ دەبنە دوو دەستە وبەربەرەکانی دەکەن وفێری ملانە وهاوکاری ولەسەرخۆیی ودەخۆڕادیوی و رێزگرتن لەمافی خەڵک و

کە زارۆک دەعاملێنێ وبۆ ژیان ئامادەی دەکا .

رێک وپێکی ووردبینی و فیداکاری وفەرمانبەری لە قانوون وزۆر ئاکاروکردەوەی کۆمەڵایەتی دەبێ .

کەوابووکایە خۆی بە تەنیا مەدرەسەیەکی گەورەیە

دەتوانین بێژین کە یاری رێگایەکە بۆپەروەردەکردنی منداڵ وگومان نیە ئەم رێگایەش رێگایەکی راست و بەکەڵکە .

**پەراوێز :**

(١) **لەیستۆک** :[لەیست (لەیستن ،لەیزین = یاری. کردن)]: ئامرازی کایە ئەسپابازی .

(٢) **زارۆک** : منداڵ بچووک .

* ئەموشانەی سەرەوە ئی لەهجەی شیمالن .

**سنووری بانە :**

شارستانی بانە لەشیمالەوە بەشارستانی **سەقز** ،لەجەنووبەوە بە**ئێراق**،لەرۆژهەلاتەوە بە**ئێراق** وسەرشیوی **سەقز** ،لە رۆژاواوە بە شارستانی **سەردەشت**ەوە لکاوە .

**هەلکەوتنی جوغرافیایی :**

بانە لەتوولی جوغرافیایی (٤٥)دەرەجەو (٥٣) دەقیقەی رۆژهەلات و ،عەرزی جوغرافیایی (٣٩)دەرەجەو (٥٩) دەقیقەی شیمال هەلکەوتووە .مەساحەتی ئەم شارستانە (٧٩٤)کیلۆمیتری چوارگۆشەیە و (١٥٤٠) میتر لە ئاستی دەریاوە بەرزە .

**کێوەکان :**

کەژوکێوو بەرزایی **زنجیرە چیای زاگرۆس** دەوروبەری ئەم شارستانەی داگرتووە **سوورکێو** لە جەنووبەوە ، سنووری بانە وئێراق دیاری دەکا .

زنجیرەی زاگرۆس لە رۆژهەلات وشیمالی ئەم شارستانەوە درێژەی هەیە . ئەم شاخانەی زنجیرەی زاگرۆس کە شارستانی بانەیان لەنێوخۆ گرتووە ،برێتین لە:

**کەلیخان ودووزین ومەیدانان** (لەشیمال) ،**بابۆسوقەرەچ دامان وحەوتاش** (لەرۆژهەلات) ، **ئاربەبە** یا **ئەربەبا ونهێنی** و **سوورکێو** (لە جەنووب) .

هێندێک کەس دەلێن چونکە زستانان بارن وگەردەلوولی بەفر لە دەوروبەری **ئاربەبا** هەلدەکا ،ئەوناوەیان لێناوە . **دووزین**یش چون لەگوێزین ـ ە ،ئەم ناوەی بەسەردا براوە .شێخ **رەزاتالەبانی** ئاوای باسی ئەربەبا کردووە:

(ئاربەبا)

ئەر بە با بێ ئەربەبا
وێران ئەبێ
با نەبێ بانە وەکوو
ریزوان ئەبێ

وجنووبی شارستانی بانەدا دەڕوا ودەڕژێتە **چۆمان** .

پێی دەڵێن **زێی گچکە ( زابی سەغیر )** کەئەویش دەڕژێتە

**چەموورووبار :**

١- **چۆمان** :لە ئاقاری چیای **نهێنی** سەرچاوە دەگرێ و لە جەنووبی بانەوە بەناری شیمالی **سوورکێودا** دەڕوا ولە ئێراق دەڕژێتە **زێی بچووک** .

٢- **چۆمی بانە** : لە **کەلیخان** وشاخی دەوروبەر سەرچاوە دەگرێ وبەنێو شاری بانەدا دەرباز دەبێ ولە رۆژاوای شارەکەوە دەچێتەوە نێو **چۆمان** .

(چۆمی شوێ)

٣- چەمی **شوێ** : لە کێوی **مەیدانان** سەرچاوە دەگرێ وبە شیماڵی رۆژاوای شارستانی بانەدا دەڕوا تا لەگەڵ **چۆمان** تێکەڵ دەبێ .

٤- **بۆیەن** :**لەقەرەج دامان** سەرچاوە دەگرێ وبە رۆژهەڵات

٥- **چۆمی کەڵوێ** : کە لە چیای **قەندیل و زمزیران** سەرچاوە دەگرێ وبەرۆژهەڵاتی

(پردی چۆمان - گوندی بلەکێ)

شارستانی **سەردەشت** ورۆژئاوای بانەدادێتەخوار وتێکەڵ رووباری **چۆمان** دەبێ وپاش ئەوەی ئاوای ئێراق بوو

رووباری **دەجلە** . **چۆمان** یانی **چەند چۆم** کە بووبن بەیەکاو .

پێویستە بگوترێ ئەم چەمانەی باسیان کرا ،چونکە ئاوەکەیان لە رێکی زەوی ، نزمترە ،قازانجێکی ئەوتۆیان بۆکشت وکاڵی ئەم شارستێنە نیە .چاک وایە دەوڵەت بۆئەم ئاوە خوادا وانە سەد هەڵبەستێ تا بەفیڕۆ نەڕۆن .

**ئاوو هەوا :**

ئاووهەوای شارستانی بانە لەبەر رەوەندی بایمێدیتەرانە ،بەهار وپایزان شێدار و خۆشە وساڵێ (٥٠٠) میلی میتر باران دەبارێ .بەڵام زستانان لەبەر رەوەندی بای **سیبری** کە بەرەو جەنووب هەڵدەکا ، هەوای بانە ساردە وبەفرێکی زۆر دەبارێ .جاری وایە دەبێ بەسایەقە ووشکەبەندێک

که ناوچەکه تەڕایی لێ دەبڕێ
زستانان سەرما بەلانی زۆرەوە
(٢٥) دەرەجە دادەگەڕێتە
ژێر سیفر .هاوینان گەرما
بەلانی زۆرەوە (٣٠) دەرەجە
هەڵدەکشێتە ژوور سیفر .

**بایەکان :**

١- شەماڵ : بایەکی
مەدیتەڕانەیی یە ، لە
ئوقیانووسی ئەتلەس- ەوەدێ
ولە چیا بەرزەکانی ئەم
ناوچەیە هەڵدەنگوێ وەدەبێتە
هۆی باران وخۆش بوونی
هەواکەی .ئەمبایە بەهاران
بەفر دەتوێنێتەوە .ئەغلەب
تەپ وتۆزی شوێنی وشک وبێ
بەفر هەڵدەگرێ وبەسەر بەفری
شوێنی دیکەیدا دەکاو سووری
هەڵدەگێرێ .کاتێک هەڵیکردە
**بای دارئاوس** یشی پێدەڵێن .

**٢- باڕەش (زریان):** ئەم

ئەگەر هەڵکا ودرەنگ بکەوێ ،
زەڕوزیان لە تەڕەکاڵ و بەراو
دەدا .

**ئاودێری :**

وەک پێشتر گوتمان سەتحی
ئاوی چۆمەکان لە ئاستی زەوی
نزمترە وسەدیان لە بەر
دروست نەکراوە ورادەی باران
کەمە وەدەرەجەکەی سیفرە .ئاوی
بن زەوی کەلکی لێ وەرنەگیراوە
وچاڵاوی قووڵ لێ نەدراوە .
زوربەی کشت وکاڵی شارستێنی
بانە دێمەیە .لە هێندێک
جێگاشکەلک لە کانیاوان
وەردەگرن وئەستێریان لەبەر
هەڵدەبەستن وکارێز لێدەدەن .
زەوی یەکی کە لەچەم نزیک
بێ بەندی بۆهەڵدەبەستن و
دەیدێرن .بەڵام هەندێک کانیاو
ئاویان زۆرە وپێویستیە

(فۆتۆی یە گەڵا)

ئەم بایە ،دار چرۆ دەردەکاو بایە لە شیماڵ (سیبری)ەوە ،
دەبووژێتەوە ،بەم بۆنەوە دێ وزۆر ساردە .باڕەش هاوینان

ئەستێریان لەبەر ساز بکرێ. ئاوی ئەم کانیاوانە راستەوخۆ بەجۆگە دەچێتە سەر زەوی وزار وپاراوی دەکا ،وەک کانی **شوێ ،بۆیەنی سەروو ،بۆیەنی خوارووی (چاوگی نێچیران)**، کانیاوێکی گەورەش لە شاری بانەیە کە بەبتوون ئەستێریان بۆ هەڵبەستووە وئاوی بۆری (لوولە)ی زوربەی شار دابین دەکا .

**داروگژوگیای بانە :**

تێروو ،گوێنی ،هەڵز ،کەما وگژوگیای کێویلکەی تر .لە شاخ وکێوی ئەم شارستانە داری گەلاپان وەک **بەڕوو ، دەمووکە ،مازوو ،ونیوڵ ،بەلاڵووک گۆیژ (گێوژ)، هەرمێ، قەزوان شەهێن** ،وچەند جۆرە داری خۆڕسکی دی ،دەڕوێ .

لێرەواری بانە تەنک و بلاوە وچونکە بۆ سووتەمەنی دەیبڕن ولک وگەلاکەشی بۆ ئاژەڵ لێدەکەنەوە ، روو لە نەمانە .

لەگوێنی ،کەتیرە دەگرن : بنی گوێنی (گەون) بە تەوەرداس دەبڕن ،پاش ماوەیەک شیرەیەک دەردەدا کە دەبێتە کەتیرە .

لەدارمازوو ،**گەزۆ** دەگرن : لک وپۆپی دارمازوو بە تەوەرداس هەڵدەپەرتێون وبە لیس دەیکوتنەوە ، ئینجا لە بێژینگی دەدەن، دەبێتە گەزۆ .

لەقەزوان، **بنێشت** دەگرن : قەدی دارقەزوان بە تەوەرداس لەلە دەکەن وکۆجیلەی بە بەرەوە دەگرن تا شیرەی بنێشت وردە وردە تێی بچۆڕێ .

**داری بەر :**

داری دەستنیای بەر بریتین لە: **سێو ،هەرمێ، هەنجیر بەهێ ،هەنار ،قەیسی،توو ، ترێ.** چونکە باخ ورەز بە شێوەی کۆن رەعەمەل دێن ،بەریان

زۆر بەکەلک نیەو ورد وبچووک وکرمۆڵن .

ترێ وهەنجیری ئالۆت وترێ رەشەی کانی گوێز وترێ سپیلکەی ئاربەبا زۆر بە ناوبانگن .

**گیانداری کێوی :**

لەشاخ ودارستانی بانە زوربەی گیاندارە کێوی یەکان هەن : ورچ ،گورگ ،بەراز ،ڕێوی کەروێشک ،چوالوو ،بزنەکێوی سمۆرە ،...کەو ،کوتر ، مراوی پەرەسێلکە ،لەق لەق ،پەپوو ریشۆڵە ،قشقەڵە ،قەلەڕەشە ،....

**گیانداری کەوی :**

راگرتن وبەخێو کردنی گیانداری کەوی وەک بزن، مەڕ گا ،گامێش ،یەکسم ،....مریشک وکەڵەشێر ،قەل ،قاز ،مراوی ... لەنێو خەڵکی شارستانی بانەدا باوە .

**دریژەی هەیە**

## ک.د.ئازاد

### وەرەوە

وەرەوە ، شوا ن وەرەوە
سالّی بێ پیت و نەهات
تێک شکا ن .
ئێستە کوێستا ن دڵە ، دڵدا رە زەوی
وەرەوە ، شوا ن وەرەوە
چا وەڕێتن کەژو کێو
را ن وشمشالّی پەشێو

*　*+　*

وەرەوە ، شوا ن وەرەوە
گلّ ، لە گەلّ هەر نەفەسێک
مەیلی لێ روا نی هەیە .
گوڵ ، لە هەر دەشت ودەرێک
مەیلی هەڵدا نی هەیە
هەور ، ئێستا کە پڕە
مەیلی گریا نی هەیە .
وەرەوە ، شوا ن وەرەوە
وەرە مزگێنی بەرە
بۆ دەرە وکێڵگە وکێو وهەوا ر .
وەرە لاپا لّ وقەدی کێوونزا ر
چا وەڕێتن بە هەزا ر .

*　*　*

وەرەوە ، شوا ن وەرەوە
ئەو کلاّشەت بکە پێ
کۆنە شمشا لّی هەوا لّت بخە بەر پشتێندت
قەفی گۆچا ن گرە دەست
پەستەکی خۆت بکە بەر
لە کەژ و کێوی ژیا ن
چا وەڕێتن مەڕ و را ن
چا وەڕێتن مەڕ و را ن .

## شەهید خالیدی زاهیدی ئارام

هەموو رۆژی چوا رشەممۆیا ن
دەچمە گۆڕستا نی بیرم
بۆ نیا زێک
بۆدوعا یەک
بۆ راگەیا ندنی را زێک
بۆ راگەیا ندنی را زێک
لەسەر گلّکۆی شیعرەکا نم
بۆ رۆلّە کۆست کەوتەکا نم
پێم ناکرێ
چا وەڕوا نی قیا مەت بم
بۆ سەرهەلّدا نەوەی ژیا ن
بۆ هەستا نەوەی شیعرەکا ن
تەما م وا یە
دەست بدەمە شەیپوورێک وتێی تووڕێنم
قیا مەتێک بەدی بێنم
خۆشەویستی وبزە وئەوین
هەتا وی ژین
بۆهەرکەسێ بووکی شیعری نەدی،بێنم

## ئەستێرە

ئەگەر سەرا نسەری ژینم
سەرم بدرێ لەبەردی سەخت
ئەگەر ئا سۆی بدختەوەریم
وەک زستا ن لێلّ و بەتەم بێ
ئەگەر هەموو شادی یەکم
سەرچاوەی کەسەر و خەم بێ
ئەگەر درەختی ئا واتم
سێدا رەم بێ
هەرگیز ، هەرگیز
کێوی ئیما ن و با وەڕم
سەری شکا ن نا نەوێنێ
چون ئومێد و ئەوینی پا ک
لە نێو دلّم هەر دەمێنێ
هەر دەمێنێ ...

کۆنە هەوار ، ئەی بەهەشتە بێ وێنەکەم!
هەوێنی ژین ، ئەی رووگە دڵ رفێنەکەم!
چەم و کانی و چیا و باخت پڕ لە رازن
هەزار چەشنە هەوێنی شیعر و ئاوازن
چاوگی تەنیات لەبن درەختی بەر شنە
جێژوانی پڕ لە ئارەزووی جوانی منە
ئێستە چۆڵە ، مایەی کزەی هەناسەمە
گۆڕستانی هیوا و ئاوات و تاسەمە
با بەیادی جارانی جوانی و دڵداری
تێر بۆن بکەم خاک وخۆڵ و بەرد وداری
ئەوا هاتووم کە جارێ تر گەلاوێژێ
تیشکی بە ناو شەوی ژینما بهاوێژێ
لەهەر ، وارێ چەپکە گوڵێ ، یادگارێ
وجانێ تر لە جێژوانی کۆنە یارێ
بەڵام هەی داد هیچ نابیسم ، زار بێدەنگە
وا شمشاڵی دروون کەیلیش گەرووی ،ژەنگە!
شەبەق دەگری وەکوو بووکی بەر دەروازە
چاوی جوانی ، زرێی ئەسری کوڵ و رازە

* * * * * *

کۆنە هەوارئەی بەهەشتە بێ وێنەکەم
ئازار گەستە ، هاودەردە دڵ بەخوێنەکەم
بۆچی تاری ، تریفەی رووت بۆچی تاری
چ بوو باری تەمی زستان لە تۆ باری
گیانە هەستە ئەوا سروەی بەیانی دێ
بەهاری کەسک وسووری زیندەگانی دێ
ئەوا دێم و هەورازە رێی چیات دەگرم
لەسەر لووتکەی "شاخەگەورە"م خۆشە بمرم
تا لە ناخی ژان و ژینتا نەتوێمەوە
لەم ئەوینە ، ناکشێمەوە ، ناکشێمەوە

گوڵەبەرۆژەیەکی شەنگ
خرابووە ناو سەبەتێک
بەڵام چەرخ و سووڕانەکەی
لەبیر نەکرد .
بەیمانەکەی بۆ تیشکی خۆر
بزر نەکرد .

* * *

نیوەشەونێک
تەڕایی لە رەگی بڕا ،
هەردوو پەلی
لە دوو تەلی رۆژهەڵاتی سەبەتەکە
توند توند بەستن ،
سەری لە بەینیان دەرهێنا
وشکایەتی بەرە بەرە
گیانی دەبرد ،
بەڵام ئەو هەر چاوەڕوانی
دەرکەوتنی تیشکی جوانی
خۆری ئەکرد !

قەچاخ

شیعرهەستە ، پڕمەبەستە
لەبۆ پیری داری دەستە
کەسێک کەشیعر پەرەستە
لەبۆنی شیعردا مەستە
قەت لە شیعرنا بێ خەستە

* * *

شیعر سۆز ، زۆر پیرۆزە
جێی باوەڕی گەل وهۆزە
وەکوو ئاگری نەورۆزە

* * *

شیعر سۆزی مووسیقایە
شیعر بڕوایە ،هیوایە
شیعر دەرمانە ، دەوایە
لەبۆ دڵانی پڕ لە کوڵ
وەکوو سروەی بەیانوایە

**یەختە کردن :** هەرچەند **یەختەکردنی** ماڵاتکارێکی ناحەزولەبەردڵان ناجەیازە بەڵام لەبەعزە جێ یەک بە قازانجی خاوەنەکەیەتی ، ئەوانەی پێیان خۆشە هات و چۆکەیان نەهێنی بێ و یەکسمەکەیان نەحیلێنێ و بزۆزی نەکا ،لە تەمەنی حەوت ساڵی یەختەی دەکەن. لەودەمە بەدوا ددانەکانی ئاڵ وگۆڕیان تێدا بەدی نایە وجێی خۆیان دەگرن باشترین کاتە بۆخەساندنی.ئەسپی یەختەکراو ئارامو ئەهوەن دەبێ وتەنیا بیرلە زگی دەکاتەوە .ئەگەر باش خزمەتی بکرێ باش گۆشت دەگرێ، بەڵام بێت وماوەیەک لە ئالیک دانی کەمتەرخەمی بکرێ کز دەبێ وچون لەباری رووحی یەوە تەواونیە درەنگ جێی خۆی دەگرێتەوە .

**لەهەمووسەیرتر یەکسم لەهەرتەمەنێکدا یەختە بکرێ تادەبێتە دەساڵە ددانی هەروالەفیەتی ئەوڕۆژەی تێیدا خەساوە دەمێنێتەوە وسەرەتای یەختەکردنی مەعلوومە. بەڵام زانینی تەمەنی دروستی یەختە زۆر چەتوونە. زۆرجار دیتراوە یەختەی ١٢ساڵە بە شەش ساڵ فرۆشراوە و کڕیاریش تەواو باوەڕی کردووە.**

"کەموکورتی یا عەیبەکان "

یەکسمی عەیبدار وەک ماڵی قەڵب سەروەخاوەنەکەیەتی بۆکڕین وفرۆشتن نابێ. ئەوعەیبانە لەکوردستان بۆ یەکسم ناسراون،یەکسمی عەیبدار لەمعامەلەدا خاوەنەکەی بۆوەی بەسەر یدا نەدەنەوە بە گۆشتی سەر چەپەر وبەهەموو عەیبێکەوە دە بفرۆشی .

١- **بەدناڵی** :ئەوجۆرە یەکسمانە **بەدفەڕولووشک هاوێژن** وئێزن بەناڵبەند نادەن وناهێڵن **ناڵ** بکرێن ، **ناڵبەند** ناچارە ئەوجۆرە وڵاغانە **لەواشە** بکا ،ئەگەر هات ولەواشەش مرزەمی نەکرد ناچارە لە عەرزی بدا!

وئینجا ناڵی بکا ،ئەوکارە چونکی مەترسی وزەحمەتی زۆری تێدایە دەبێتە هۆی خەرجێکی زیادی بۆخاوەنەکەی وهەموو ناڵبەندێک بۆی ناڵ ناکرێ .

٢- **سەرسمدان** : سەعزە یەکسمێک کەم هۆشە وباش سەرنجی رێ وپێشەخۆی نادا و جارناجارێک هەڵدەنگوێ و **چۆک ولمبۆز** و تەنانەت جاری وایە نێوچاوانی لە عەرز رادەکێشی وسوارخۆی بۆناگیرێتەوە**ورمبە لە عەرز دێنێ** ،ناسینی ئەو یەکسمانە بەسانی یە چونکوو بەدایم شوێنی برینیان لە

**ر:رەشەحمەدی**

سەرچۆکی دیارە، پتر ولاغی یۆرغە دووچاوی ئەو عەیبەیە و لەترسی هەڵدێران دەیانکەنە **ولاغی باری.**

٣- **وەستەگی:** ئەو جۆرە یەکسمە چونکوو ئەو سوارەی لە ئەوەڵەوە گرتوویەتی لێزان وشارەزا نەبووە و لەپاشان خاوەنەکەی نەیتوانیوە باشی بعاملێنێ، **تەوەزەل و نازنازی** بار هاتووە وزۆرجار لە هەوراز پێ دەچەقێنێ و **دەفان دەدا** وتابشتی رێ بڕینی نامێنێ .

٤- **جەنە: جەنە** یا **مانگری** یەکێک لە هەرە عەیبە گەورەکانە کە چاوپۆشی لێناکرێ، ولاغی **جەنددار** هەر جێ ورێیەکی بەکەیفی نەبێ پێی لێ دەچەقێنێ، جاری وایە لەجێی زۆر چڕ و حاسێ مان دەگرێ و پاشەوپاش دەکشێتەوە و بەزەیی بەخۆی و بارو سواریدا نایە و هەڵدەدێرێ لەبیربردنەوەی ئەو عەیبە زۆر چەتوونە تا ئێستا بۆ وەی چارەی ئەو ئاکارە بکەن ولاغی مانگریان کردۆتە **یەخترمە** و لە دووی یەکسمی چاکیان راکێشاوە ،یەکسمی مانگر بۆ رۆژی لێقەومان نابێ.

لەوبارەوە زۆرم پرس و را کردووە .زۆرکەس پێیان وایە ئەویەکسمانە بۆخاوەنی پێشوویان بە پەرۆشن و حەز لە سواری بێگانە ناکەن، لە جێیەکی دیش دیتراوە جەنەدارترین یەکسم نەیتوانیوە لەژێر سوار چاکان مان بگرێ کە وابێ یەکسمیش سواری خۆی دەناسێ و دەزانێ شارەزایە یا نا، بەبڕوای من ولاغێک کە ماوەیەکی زۆر کارێکی تایبەتی پێدەکرێ و بە رێیەکی تایبەتیدا هاتوچۆ دەکا ئەو هاتوچۆ و کارەی لێ دەبێتە عادەت بێتوولە ناکاو لێی بگۆڕی مان دەگرێ و بە واتەی مەشهور تەرکی عادەت دەبێتە هۆی نەخۆشی.

**سڵی:** سڵی یا **ترسەنۆکی** زۆر کەس بە عەیبی نازانن و تەنانەت زۆریشیان پێ باشە. یەکسمی سڵ بە پێچەوانەی ولاغی **مانگر** دایمە **گوێ قولاغ** و ئامادەیە ،خشپەیەکی لێ بکەی دەردەپەڕێ.هەر بۆیە یەکسمی سڵ پێویستی بە سواری وریا و **قۆچاغ** هەیە. دەنا بێت و لە نەکاو لە شتێکی بترسێ و بسڵەمێتەوە سەروملی سوار تێک دەکاتەوە

**یاڵ وبژبادان:** سەیرترین شت کە بۆ بەعزە یەکسمێک رووددا هەر ئەو یاڵ و بژ بادانەیە، زۆرجار بەچاوی خۆم دیومە یەکسم شەو لە تەویلەدا بووە بەیانی کە هەستاوین دیتوومانە یاڵ و بژی بەرێک وپێکی هۆنراوەتەوە لەم بارەدا زۆرم پرسیوە ،

**هەموو پێیان وایە شەیاتین بە شەو سواری بوون ویاڵ وبژیان هۆنیوەتەوە. پتر یەکسمی بۆرە وای لێدێ و ئەوجۆرەی پێویستە هەڵنادا. بۆبەرگری لەمکارە ،یاڵی هەڵدەپاچن و کلکی قوڵە دەکەنەوە.(راستی یا ناراستی ئەم قسەیە بەستۆی نووسەرە. سروە)**

( رەنگەکان)

یەکسم ئەو رەنگانەی هەیە .

**١- کوێت : رەنگی ئەسپی کوێت سوورە ،هەڵدەکەوێ کلک و یاڵی رەش بن،کوێتی چەقەڵ خاڵێکی سپی لەنێو چاوانە، لە رەنگ وکاردا زۆر پەسەندە بە تەجرەبەی پێشینیان نەوسنە و زووتر و پتر لە جۆرەکانی دی کام دەکا .**

**٢- کوێتی قاپ رەش:رەنگی سووری تاریک و مەیلەو رەشە کلک و یاڵ و لە ئەژنۆیانەڕا بۆ خوارێ تەواو رەشن.**

**٣- رەش کوێت: ئەویش وەک کوێتی قاپ رەش رەنگی سووری تاریکە و لەبەر زگیڕا بۆ خوارێ رەشە،**

**٤- شێ : رەنگی سووری کاڵی ئامال زەردە ،سەری زل و ناقۆڵایە ،بەعزێکان جاغیکی سپییان بەنێو چاواندا هاتووە یا لەژێر ئەژنۆیانڕا بۆ خوارێ سپییە، بەو پەڵە سپییانە نێوی ناگۆڕی وهەر بە شێ دەناسرێ،یەکسمی شێ بە تەجرەبەی پێشینیان لە**

شێوەردان کەنەفتە .

شێ سێ جۆرە :

١– شێ ٢– شێی یەغز کە رەنگی بەرەو کوێتی دەچێ.
٣– شێی خورمایی.

٤– بۆرە : رەنگی ئامال سپیلک دەچێ و لەپیری دا مووی لەشی پنۆک پنۆک دەبێ و لێک دیاردەبێ ئەسپی بۆرە بۆ نێو دروان باش نیەو باش رێ نابڕێ و مێشوولە زۆری تێدەهالێن

٥ – شین بۆرە :ئەویش جۆرێک بۆرەیە بەڵام مەیلەو تاریکە، زوربەیان پنۆک پنۆک و جوانن و شین بۆرەی گوڵ گوڵی یان پێدەڵێن، لە بۆرە پەسەندترن،کلک و یاڵیان تەواو رەشە و وردە وردە کە پیر دەبن رەنگیان کاڵ دەبێتەوە ،شین بۆرەی وایە رەنگی لە شین بۆرەی گوڵ – گوڵی تاریکترە ئەو دەستە یەکسمە بە شین بۆرەی تاری ناسراون،کاتێک شین بۆرە رەنگی زۆر زۆر تاریک بێ پێی دەڵێن " ئەبرەش" بەعزێک شین بۆرە لەجیاتی خاڵی رەش خاڵ و پنۆکی سووری لەسەر پێستە ئەو دەستە یەکسمە بە " سوورخوون" ناسراون .

٦– رەش : ناوی بەسەر خۆیەوە ، بەڵام جار و بار هەڵدەکەوێ لە ئەژنۆ بەرە ژێر یانێوچاوانی "قەشان" دەبێ .بەوە ناوی ناگۆڕێ و هەر ئەسپی رەشی پێدەڵێن .

٧– ئەبڵەق: ئەو تۆرەمە یەکسمە رەش و سپی یا سوور و سپی و ئی واهەیە چەند رەنگی ئاشکرای لێ دیارە ، خەڵکی کوردستان پێیان دزێون و لایەنگریان کەمە .

٨– زەرد : ئەو یەکسمە رەنگی لە شی کاڵتر وتەواو بارەو زەردە .کورد پەسندی ناکا وپێی وایە وەستەک و کەم دەوامە .

ئەم بەقلە ئێنساس لەلای بەسالە کۆنەکان لەسەر زارورمانابە.

دەگێرنەوە رۆژێک (کوێرئۆغڵی) لێی دەقەومێ ولەگەڵ کوڕەکەی ناچار دەس هەڵێن.کوڕەکەی ئامۆرکاری دەکاودەڵێ :

– رۆڵە ئەگەر کاری ئاوت بوو ،دوژمنی قەستە – سەریشت لەدووبێ، دابەزە کاری ئاوەکەت بکە ئینجا! سواربەوە ورکێف لێدەوە .

وادەبێ مەودایەک لەبەر دوژمن رادەکەن.کوێرئۆغڵی بۆخۆی چاوی نابینێ.کوڕەکەی ئاوڕدەداتەوە دەبینێ سوارێکیان بەدواوەیە .بە نیگەرانی بەبابی دەڵێ :

– سوارێکمان بەدواوەیە .

کوێرئۆغڵی دەڵێ :

– ئەسپەکەی چ رەنگە ؟

کوڕەکەی دەڵێ :

**- شێ یە**

کوێرئۆغڵی دەڵێ :

**- ئەسپەکەی خۆت لە شێوەرد بدە. ئەسپی شێ لەشێوەردان زوو پەکی دەکەوێ .**

کوڕە بەقسەی بابی دەکا ولە سوار رزگار دەبێ .سەرلە نوێ کوڕەکەی ئاوڕ دەداتەوە دەبینێ سوارێکی تریان بەدواوەیە .بەبابی دەڵێ ئەسبەکەی بۆرەیە . کوێر ئۆغڵی دەڵێ :

**- ئەسپەکەت لە دڕک و داڵ بدە .یەکسمی بۆرە لە دڕوو دەترسێ .**

دیسان بەقسەی بابی دەکا ولەویش دەرباز بوون. پاش ماوەیەک ئاوڕ دەداتەوە سوارێکی تر دەبینێ، بە بابی دەڵێ :

- ئەوجار ئەو سوارەی بەدوومانەوە یەکسمەکەی **کوێتە .**

کوێر ئۆغڵی دەڵێ :

**- کەوابێ لینگ بدە ئەسپی کوێت هیچی لەگەڵ ناکرێ ، بەڵام رۆڵە لەبیرت بێ ئەگەر گەیشتەوە سەرمان یەک بەخۆت هاوار بکە "جۆجۆ ... جۆجۆ ..." چون یەکسمی کوێت نەوسنە . ئەوی بەڵکوو فێڵەکەمان بیگرێ و ولاغەکە بەبیستنی ناوی جۆ کام بکا .**

**لمبۆز :** دەمولێوی یەکسم بە کونەلووتەوە .

**سەرلمبۆز :** ئەوجێگەیەی زنجیری رەشمەی دەکەوێتە سەر .

**یاڵ :** مووی درێژی ملی ئەسپە

**بژ :** مووی کورتی ملی ئەسپە لەبەعزە شوێنێک بەکاکۆڵی یەکسم دەڵێن بژ .

**سەرجدەو :** بەسەرشانی یەکسم دەڵێن .سەربدەوو بدەوگەشی پێدەڵێن . ئەگەر یەکسم ئارەقەی سارد بێتەوە شان و پیلی دەگیرێ ودەڵێن جدەو بووە .

**یاڵ کوت :** ئەو جێ یەدی کورتانی لەپێشەوە دەکەوێتە سەر ، بەگرانابی بار دەکوترێتەوە جاری وایە بریندار دەبێ و دەڵێن یاڵ کوت بووە . برینی یاڵ کوت درەنگ چاک دەبێتەوە .

**نێوکەڕەشە :** نێوەڕاستی کورتان دەکەوێتە سەری و ئەستەمترین جێی پشتی یەکسمە .بێ وبریندار بێ زۆر درەنگ چاک دەبێتەوە .

**قوونەگاز :** ئاخری کورتانی دەکەوێتە سەر .

**ماسیلکە :** نێوانی قوونەگاز و بەتالایی مایە .

**کەفەڵ :** پانایی سەرسمتی یەکسم کەفەڵی پێدەڵێن .

**کۆڵمت :** جێگای پێک گەیشتنە- وەی ئێسکی ران ولەگەنە .

**نێرگز :** ئاخری کلک نێرگزە بۆئەوە کە یەکسم شۆخ بێ وکلکی هەڵێنی نێرگزی دەبڕن .

**بەتالایی :** بە کەلەکەی یەکسم دەڵێن .

شەرحی ئەوجێگایانەی کە بەرچاون و هەموو کەس دەیانزانێ بەپێویست نازانم .

**پیرانشار ،جەلدیان ـ عەلی ئیسماعیل زادە :**

لەمهەموو زەوق وهیوا بەخۆ بوونەت زۆر خۆشحالین . هیوادارین هەروەک ناوت لە خۆت ناوە ، ببی بە "هێمنی دوارۆژ" . هەموو غەموپەژارەی ئێمە ئەمەیە کە "هێمن" مان لەدەست چووە . ئێستا کە "هێمنی دوارۆژ"سەری هەڵداوە وسڵاو لە حافزوفردەوسی دەکا زۆر شادین .بەلام تکات لێ دەکەین دەرسەکانیشت فەرامۆش مەکە ، چونکە هەلی خوێندن ئەگەر لەدەست بچێ ، ئیتر هەڵناکەوێتەوە . بۆ شاعیربوون ماوەت زۆرە .

**ئەندیمشک ـ** عەزیز ئازاد :

هەر وەک خۆت نووسیوتە شاعیر نی .زەوقی نووسینت هەیە .خۆت بەنەسرەوە ماندوو بکەی چاکترە .

**گوندی کولتەپەی قورمیشی بۆکان ـ** سەیدجەمالەدین کەریمی :

چیرۆکەکەت زۆر کورتە و لەباری نیوەرۆکیشەوە لاوازە . ئی باشترمان بۆ بنێرە .

**گوندی دایەشێخ ،لاجان ـ** مستەفا محەممەدی :

تکایە لەبارەی"فەقێ یەتی" ـ دا وتارێکی درێژترمان بۆ بنووسە . ئەم باسەزۆری بەرەوەیە ودەکرێ بەوردی بنووسرێ وکەلکی لێ وەربگیرێ

**سەقز ـ** شاهۆ زەمانەسازی :

برای بەڕێز ، ئەگەر لەدەستت دێ بەسەرهاتی ئەم دوو زانایەمان بۆبنێرە تا بەنۆرەی خۆ چاپی بکەین .

**بانە ـ** حاجی رئووف سەلیمی :

برای بەڕێز ، بەداخەوە چونکە ناوی شاعیرەکە مەعلووم نەبوو بۆمان نەلوا شیعرەکان چاپ بکەین .

**سەقز ـ** محەممەد پەرویزی :

تەرجەمەکان شیاوی بڵاو کردنەوە نەبوون .هیوادارین بەرهەمی بەکەلکمان بۆبنێری.

**بۆکان ـ** سەلاحەدین عەبدوڵڵا ـ زادە :

هەوڵ بدە فکروخەیاڵی خوت بخەیە کار وبەچاوی خۆت لەدنیا بڕوانی . شیعرەکەت بەسەریەکەوە لەباری وەزن و قافیەوە باشە ، تەنیا لەم دوو بەیتەدا وەزن و قافیە تێک چووە :

لەباری قافیەوە :

من لەناو قەفەس بەندم
زنجیرە

تۆ لەناو باخان دەکەی
راوێرە

بۆ **زنجیر** دەبێ وشەی وەک **پیر بەخسیر ، نیر** ، ... بکرێتە قافیە .بۆ **راوێرە** دەبێ وشەی وەک **گێرە ، سێرە ، شلێرە** ، ... بکرێتە قافیە .

لەباری وەزنەوە :

من دوور لەئاو و هەوای
نیشتمانم

تو وەرە رۆشن کەوە چرای
ژیانم

بۆئەوەی وەزنەکە تێک نەچێ لەمیسراعی یەکەمی ئەم بەیتەدا ،وشەی **نیشتمان** دەبێ بە **نیشمان !** بخوێندرێتەوە و لەمیسراعی دووەمیشدا دەبێ **کەوە** دەربا وێژین . ئاشکرایە بەمکارەش مەعنای بەیتەکە تەواو دەشێوێ .

**بۆکان ـ** جەمشید ئەحمەدی :

برای بەڕێز ، ئەگەر کتیبێک بۆکرین وەگیرنەکەوت دەتوانی بەئەمانەت لەدۆست و ئاشنایان وەری بگری .

مامۆستا هەژار کتێبی زۆرە هێندێکیان ئەمانەن : شەرەفنامە (تەرجەمە) بۆ کوردستان (شیعر) ، هۆزی لەبیرکراوی گاوان (تەرجەمە) ئاڵەکۆک (شیعر) دایەباوەکێ حراوە (تەرجەمە) ، ئارێ برا وا رابرا (تەرجەمە) . یەک لەپەنای خاڵ و سفری بێ برانەوە ( تەرجەمە) ، ...

بەرهەمەکانی مامۆستا هێمن : تاریک وروون (شیعر )

نالەی جودایی (شیعر)، هەواری خالی (چیرۆک وقەتعەی ئەدەبی) پاشەڕۆک (وتاروشیعر)، توحفەی موزەفەرییە، شازادەوگەدا (تەرجەمە)، قەلای دمدم (تەرجەمەی کوردی بەفارسی)..

ماموستا حەقیقی ئەگەرچی شیعری زۆرە، بەلام هێشتا بە کتێب بلاو نەکراونەوە.

بۆفێربوونی ڕێنووسی کوردی، کتێب زۆر نووسراون. سروەش تارادەیەک دەتوانێ یاریدەت بدا.

**بانە**: عەبدوللا عەباسی

١ـ شیعرەکەت لەباری زمان وتەعبیرەوە پتەو نیە. بۆوێنە لەم بەیتەی خوارەوەدا، عیبارەتی " **ئاوی ڕەحمەت پێویستی کورد** " دەبوو ئاوا بێ: "**ئاوی ڕەحمەتی پێویستی کورد** ". ئەلبەتە دیسانیش تەعبیرەکە دلان نابزوێنێ، چونکە شتێکی تازەی تێدا نیە ئەمجۆرە تەعبیرە ئەوەندە گوتراونەوە کەئیدی بوونەتە قسەی عادەتی:

**ئاسمان بووی کەلێت باری**
**ئاوی ڕەحمەت پێویستیکورد**
**بەپێنووست شێفت بڕی زەوی**
**وزاری پێخوستی کورد**

عیبارەتی "**منبع الادب**" کە لەسەرەتای شیعرەکەدا هاتووە لەگەل عیبارەتەکانی دیکەی شیعرەکە ڕێک ناکەوێ. "پێنووس"ی داتاشراوت لەبری "**قەلەم**" بەکار هێناوە.

وشەی وەک **هەست** و **پێخوست** و **خۆشەویست** ـ ت کردوونە قافیە. چاک وابوو پیتی پێش "س" ەکانیش یەک بن، وەک: هەست، دەست، مەبەست خەست، دەروەست، ...

٢ـ ئەم میسراعە، میسراعی یەکەمی غەزەلێکی **نالی** یە و وەزنەکەی "ڕەمەل"ە ئەمەش تەقتیعەکەی:

**ڕیشەکەی پا** (فاعەلاتەن)
**ن و درێژە** (فاعەلاتەن)
**بۆ ڕیا خز** (فاعەلاتەن)
**مەت دەکا** (فاعەلا)

دەجا ئەگەر جێگای ( **بۆڕیا** )و ( **خزمەت دەکا** ) بگۆڕین، وەزنەکە دەشێوێ.

**بۆکان** ـ یوسف مستەفا:

مەوزووعی وەک **دروێنە** و **شکارتەکێلی** و **خەرمان هەلاویشتن**، گشتین. یانی مەحسووسی تاکە ناوچەیەکی کوردستان نین. لەبەر ئەمە دەکرێ بێ ئەوەی باسی شوێنێک یا کەسێکی تایبەتی بێتەگۆڕێ، بیانووسی. بۆ (وێنە)ش خودا گەورەیە. **تۆ** تەنێ وتارەکەمان **بۆبنێرە** باقی لەئەستۆی **ئێمە**.

**خالەمین شاعیرێکی پیرەو** ئێستاش لەنەغەدە دادەنیشێ سەوادی قەدیمی هەیە. شیعرەکانیشی لەلای خۆیەتی.

برای بەڕێز، کە ئێمە دەلێین فلانە کتێبمان نیە بۆتانی بنێرین، مەعنای ئەوە نیە کە کتێبەکە لە کتێبخانەی تایبەتی خۆشماندا نەبێ.

**بۆکان** ـ محەمەد سەعیدنەجاری (ئاسۆ):

ئەلف وبێتکەی کوردی لەمێژساله بنەگرتوو بووە چاپکردنی بۆ چوون و ڕای هێندێک خوێنەر بەم مەعنایە نیە کە ڕێنووسی کوردی لەم بارەوە کەموکووڕی هەیە.

**سەقز**ـ موحسین مەسعوودی:

هەولْ بدە چاکتر فێری نووسین وخوێندنەوەی کوردی بی. باش وایە بەکوردی نامەو "دیاری"مان بۆ بنێری.

**نەغەدە**ـ ئیسماعیل عەزیزی:

دۆستی ئازیز، وتارەکەت زۆر کورت بوو. نووسین لەبارەی شاعیراندا لەسەر ڕۆیشتن ولێ وردبوونەوە و شی کردنەوەیەکی دەقیقی پێدەوێ.

**سەردەشت** ـ عوسمان مەرجان:

شیعرەکەت لەباری قافیەوە باشە بەلام لە هێندێک شوێن وەزنەکەی تێک چووە. بۆ وێنە

میسراعی یەکەمی ئەم بەیتە دەبوو وەک زوربەی بەیتەکانی دیکە (١٠) هیجا بێ نەک (١١) :

**با بۆت بگێڕمەوە ژیانی رابردوو**
**هەزاران هیوا هەمووی با بردوو**

ئەگەر "با"ی سەرەتای میسراعەکە هەڵبەرتێوین . وەزنەکە ساغ دەبێتەوە :

**بۆت بگێڕمەوە ژیانی رابردوو**

لەباری زمانیشەوە حێ حێ قەڵەمەکەت هەڵەنگوتووە :

**من کەتۆم دیتی لە ناو گشت گوڵان**

"**تۆمدیتی**" هەڵەیە . کورد دەڵێ : "**تۆم دیت**" یا "**تۆم بینی**". ئەڵبەتە تەنیا عیبارەتی دووەم لەگەڵ وەزنی شیعرەکە دەسازێ :

من کە **تۆم بینی** لە ناو گشت گوڵان.

برای بەڕێز! سفەتێکی گرینگی شیعری راستین "**ئیجاز**" یا "**کورتەبێژی**"یە کە بەداخەوە لەشیعری تۆ و زوربەی شاعیرە لاوەکاندا وەبەرچاو نایە . هیواداریــن ئەم فەرمایشتەی "**نالی**"تان هەمیشە لەبیر بێ :

**(نالی)عەجەب بە قووەتی حیکمەت ئەدای دەکا**
**مەعنای زۆر وگەورە بە لەفزی کەم و بچووک**

شیعری ئەم ئازیزانەمان بەدەست گەیشتووە هەروەک زۆر جار رامان گەیاندووە ،خاوەنی ئەم شیعرانە هەستێکی ناسکیان هەیە ولەنووسینی نامەکانیاندا وادەردەکەوێ کەبەسەر پەخشاندا پترزاڵن بەلام شیعرەکانیان لەباری وەزن وقافیەوە کەم وکووڕی هەیە . لێرەدا داوایان لێ دەکەین کە پتر خۆ بە پەخشان نووسینەوە ماندوو بکەن کە پتر جێگەی خزمەت بە زمان وئەدەبی کوردییە .

**تەورێز** ـ کەماڵ کەریمی
**سەردەشت** ـ خدر مەحموودیان
**پیرانشار** ـ چیا ـ ق .

**نەغەدە** ـ حەسەن محەمەدی
**بۆکان** ـ مستەفا ئیسماعیل پوور
**بانە** ـ ح . هێرش .
**داشبەندی بۆکان** ـ سەید کەماڵ لەتیفی .
**بۆکان** ـ حەکیم فەیزی
**سەردەشت** ـ رەحمان حاجی
**سنە** ـ ئەحمەد مودەڕیسی
**سەردەشت** ـ کەماڵ شەمامی .
**کولتەپەی بۆکان** ـ پشکۆ .
**سەقز** ـ ح . رزگار .
**سەرچنار ،چۆمی مەجیدخان** ـ محەممەد چاوەپوور
**پیرانشار** ـ ئەبووبەکر رەحمان پوور .
**ناوچەی سەردەشت** ـ قارانی .
**قولقولەی سەقز** ـ سەلاح ئیبراهیمی .
**نەغەدە** ـ رێبوار سلێمان بایزیدی .
؟ ـ رەحیم محەممەدزادە .
**یەنگیجەی بۆکان** ـ محەممەد شیوەن .
**کولتەپەی بۆکان** ـ حەکیم فەیزی .
**کرماشان** ـ سەید مەسعوود هاشمی بەرزنجی .
**داشبەندی بۆکان** ـ سەیدکەماڵ لەتیفی .
**میرئاوای بانە** ـ ح.ر. هێرش .
**شنۆ** ـ محەممەد چووکەڵی .
**بۆکان** ـ مستەفا ئیسماعیل پوور
**چەقەڵ مستەفا،نەغەدە** ـ حەسەن محەممەدی .
**چەپەرئاوای شنۆ** ـ تەها چیانە
**سەقز** ـ جەلال سەرشیو .
**پیرانشار** ـ چیا . ق .
**بانە** ـ سەید موحەممەد بەرزەنجی .
**تەورێز** ـ کەماڵ کەریمی .
**نستانی سەردەشت** ـ خدر مەحموودیان .
**قەزوێن** ـ زوبەیر سەلیم .

بۆهەزارەمین جار لە پلەکانی ئیدارەی دادگوستەری وەسەرکەوتم .وەک هەمیشە لەسەرسەرای ئیدارەدا جەماوەرێکی زۆر بێکیان داویشت بەزەحمەت خۆم گەیاندە وەتاغی "دادیار" سەی حەوت کەس دەوورەیان دابوو هەرکەسەی پرسیارێکی دەکرد و ئەویش بێ ئەوەی سەرهەڵبێنێ وێرای هەڵدانەوەی لاپەڕەی پەروەندەکانی بەردەستی جوابی دەدایەوە: "بڕۆ سەش مانگی دیکە وەردوە !"، "پەروەندەکەت ناتەواوە" "حەواڵەی تارانمان کردووە" و.......

ماندوویەتی وبێزاری لە گیان ولەشی دەباری . وەک مەکینەی تێک شکاو بەلەقەلەق کاری دەکرد وهیچ دنەیەک حیالە «بەڕێ چوون» لەکاریدا بەدینەدەکرا . هەموو رۆژێک تا ئاخری وەختی ئیداری بە کورسی یەکەوە دەنووساوبە بێوازی جوابی ئەموئەوی دەداوە وسبەی هەمەن هەمان بۆئەنجام دانی رۆژەکارێکی دیکە دەهاتەوە .

یەکەم جار دوازدەساڵ لەمەوبەر ، هاتمە خزمەتی و شکاتنامەیەکمدا دەستی . لەوساڵەدا ،ناپیاوێکی بەرواڵەت دۆست ،سەت هەزار تمەنی لێ وەرگرتم کە خانووم بۆبکڕێ ولەکرێ گرتە- یی رزگارم بکا ،کەچی بەداخەوە پارەکەی خوارد و ئاکرکەوتە دادگا . بەم حیسابەی رامگرتبوو لەمدەی ئەمدوازدە ساڵەدا، ئەمڕۆ هەزارەمین جار بوو کە دەهاتمە "دادگوستەری" تا بزانم کاربەکوێ گەیشتووە .

پاش دووسەعات چاوەنواڕی "دادیار" سەری هەڵبڕی و نیگامان تێک بەزین .پرسیارم کرد:

قوربان چ بوو؟ کارەکە چی لێهاتەوە؟

فەرمووی :

ـ تۆ زۆر بەپەلەی ، ناردوومە بیگرن ،لەماڵ نیە نەیان دیوەتەوە . پەلەمەکە هێندێک پشووت لەسەرەخوبێ !"

خۆم بۆرانەگیرا ،بەتووڕەیی- یەوە گوتم :

ـ ئاخر قوربان سەبر ناکەی ؟راوەستان تاکەی ؟ دوازدەساڵە سەبرم گرتووە خۆ من حەزرەتی ئەییووب نیم! چۆن نەتان دیتۆتەوە! چما ماڵی لە کێوی قافە! هەر ئێستا وەرنبتاندەمە دەستی . ئەوالەم چایخانەی ژێر ئیدارە دانیشتووە و قلیان دەکێشێ ."

بێ ئەوەی سەرهەڵبڕێ جوابی دامەوە:

ـ ئێمە حەقمان نیە خەڵک لە کووچە وکۆڵان وچایخانە و جێگای ئاوادا بگرین؛ تەنیا

دەتوانین بەرگەی جەلبی بۆ بنێرینە ماڵ یا جێگەی کارەکەی لەوەزیاتر دەستمان ناڕوا.

- قوربان دەسەرت گەرێم ئاخر ئەوە دوازدە ساڵە من بەدووی ئەم پەروەندەیەدا هەڵوەدام. خوا هەڵی ناگرێ، پێغەمبەر قەبوولی ناکا. فەقیرم، لە کاروکاسبی بووم. هەرنەبێ مەئموورێکم ڕەگەڵ بخەن خۆم بیگرم و بۆتانی بێنم، بزانین دەڵێ چی"

لالانەوە و پاڕانەوە کاری خۆیان کرد. زەنگی لێدا، پاسەوانێکی بانگ کرد وگوتی:

- سەرکار، بۆت دەنووسم سەی دەگەڵ کاک هەمەوەند دەچی بۆماڵی "عەبەقاچاغچی" و دە یهێنی بۆئێرە!"

زۆرم دوعا بۆعەمروماڵی کردو قەرارمان دانا سبەی ئێوارە دەگەڵ "سەرکار مەمدەلی" بچین "عەبەقاچاغچی" بگرین. ئیدارەم بەجێ هێشت و بۆ هەزارەمین جار رووم کردە چایخانەکەی ژێر دادگوستەری. قاوەچی وشاگردەکانی منیان لە باوک وبرای خۆیان باشتر دەناسی. هەروەژوور دەکەوتم، قاوەچی دەستووری دەدا "کوڕە چایەکی تازە بەرە خزمەت کاک هەمەوەند! قەنەی بۆ تازەکەوە! بزووا"

زوربەی موشتەری ئەم چایخانەیە ئەوکەسانە بوون کەسەروکاریان لەگەڵ دادگوستەری وشکایەت و شکایەتکاری هەبوو. شکایەتکا - رەکان لەبەرێک وشکایەت لێکراوەکانیش لەبەرێکی دیکەدا دادەنیشتن. بەری شکایەتکاران، هەموو کزو داماو وخەفەتبار بوون و شکایەتلێکراوەکانیش

ئەعلەب مل ئەستوور و بەکەیف ودەماغ بوون وجارجارە لانا ویشیان داویشت وتیزیان بەشکایەتکارەکان دەکرد. چایەکەم خواردەوەو دەستم کرد بەقەنەکێشان. "عەبەقاچاغچی" بەرامبەرم دانیشتبوو، بەفیروهەوا قەنەی دەکێشا ولەگەڵ چەن کەس لە دزودرۆزن وکلاو - بەردارەکانی هاوالی قسەیان دەکرد. بەزنێکی سووری دەنگ زلی هەڵدەسووراند و جارجار چاوێکی لێدەکردم و بزەی دەهاتێ وبەهاوڕێکانی دەگوت:

- باهەر شکایەتم لێ بکەن! هیچیان پێ ناکرێ ئەوە دوازدەساڵە هیچ یان پێ نەکراوە ...

یەکی دیکە قسەکەی بڕی و گوتی:

- تازە تێ دەگەم باشترین کاسبی هەرئەوەبە بوولی خەڵک بخۆی وشکایەتت لێ بکەن!. هەر ئەوەندە زەحمەتە کار بکەیتە دادگوستەری. تازە لێت ناستێندرێتەوە!

لەدڵی خۆمدا گوتم "دەردت لە گیانم عەبە! جا چاوت لە بەبەتێنی سبەی بێ!

هەستام وچایخانەم بەجێ هێشت وبەرەو ماڵ بوومەوە. هەرچۆنێک بوو ئەو شەوەش رابرد. لەبەربەیانیڕا

قاسید بووم بزانم "عەبـــە"
بۆکوێ دەچێ وچ دەکا .

ئەورۆژە شانس وبەخـــت
هێنای وعەبە لەبەردەرکـــی
خۆیان ودەروحیرانــــــان
راوێچکەی بەستبوو. وێوەتـــر
بەدەچوو. وەختی خۆی ڕۆیشتـــم
لەگەڵ "سەرکار مەمدەلـــی"
رووماں کردە مـالّی "عەبـــە"
لەدرگاماں دا وژنێک درگـا ی
کردەوە . وەژوور کەوتیـــن و
عەبەماں ویست .ژن جوابـــی
داوە:"لەماڵی ئەوحیرانەمانــە
ئەوە دەنێرم لەدووی". بـــە
دوابدا وەدەرکەوتین ولـــە
بەردەرگا راوەستاین . زۆری
بی نەچوو "عەبە" و چـــەن
کەسێک لەمالی حیراں کـــە
نەبیا چەں کەزێک لە مالّـــی
"عەبە" وبوەتر بوو هاتنەدەر
ولەبەر درکا راوەستـــان و
بۆلای ئیمە بەهاتن . .چاویکـم
لە "سەرکارمەمدەلی" کرد .
"بەماڵە! حۆیەتی!ئـەوەی
تەزبیحی سووری دەنک زلـــی
بەدەستەوە "عەبە"یە ." سەرکار
هیندێک راما ومتەقی نەکرد .
دیسان پێم گوتەوە"دەی کاکـە
دەی ! لەچی راوەستاوی ؟"
گوتی :
ـ دەزانی چیە کاکە حـان
من ناتوانمەوە .بچمەوە بـەر
دەرکی خەلک . هەردەتوانـــم
لەمناونیشانە کە پی بـــان
داوم بیگرمەوە! ئەویش لەمال
نیە ! لەجیگای خوی نیـــە! "
قەلەمەکەی دەرهیناوبـــە
خەتێکی ناخۆش لەژێر ئـــەو
نامەی"دادیار" پێی دابـــوو
نووسی "خواندە درمحل نبـــود-
شکایەت لێکراو لەماڵ نەبوو"
پرتەوبۆڵە ودادوهاواری مـن
بێ فایدە بوو ." ســەرکـــار
مەمدەلی " بولای عەبە نەچـوو
ونەچوو .پاشان بە سرتە پێـــی
گوتم :
"کاکەجان ئەگەر کابــــرا
هەردووگەز لەوجیگایەی کـــە
گەرارە بگیرێ دوورتـــــــر
راوەستێتەوە هەگمان نیـــە
بیگرین وگسەی دەگـــــە ل
بکەینەوە! گانوون،گانوونە !
بەلێ بەراستی "گـانـوون
گانوونە! " بەتەواوی تێگـە ـ

یشتم چ باسە! "عەبە" کـــە
هەرچەند گەزێکمان لی دوور ،
بوو .قاقابیمان پیدەکەنـــی و
هەر بەهیندیشی نەدەزانین :
سەبەنی رۆژی دوایــــــی
**بۆ هەزارویەکەمین جار لــە**
**پلەکانی دادگوستەری وەســەر**
**کەوتم وچوومەوە خزمـــــەت**
**"دادیار." بێ ئەوەی مۆڵەتـــی**
**گازندە وزووخاو هەڵڕشتنـــم**
پێ بدا فەرمووی :
ـ راپۆرتی مەئموور دەلێ
"خواندە درمحل نبود" . بـڕۆ
چوارمانگی دیکە وەرەوە! ئەم
نامەیەش لەگەڵ خۆت بەرەبـــۆ
بایەگانی .خواحافیز! "
نامەم وەرگرت وچوومـــــە
ژووری بایەگانی .بایەگـــان
پیرەمێردیکی ٥٠- ٦٠ ساڵـــە
بوو . لەمدەی ئـــەم دوازدە ،
ساڵەدا ببووینە دۆستـــــی
نیزیک .نامەکەی لێ وەرگرتم
وگوتی :
ـ چوارمانگی دی ! چــوار
مانگ هیچ نیە ! "
هاوارم کرد :
ـ ئەی هاوار ئەوەدەڵێـــی

چی ؟. چۆن چوار مانگ شتێک نیە!"

وەڵامی نەدامەوە ، بەلام بەپەلە وبەلەرزە لەرز پەروەندەیەکی هێنا ولەپێشی دانام و گوتی :

"شاکی شەماشاکە! بزانە ئی ش ژەمانیکە! هێشتا تەواو نەبووە!"

پەروەندەم کردەوە، زۆرم سەروبن کرد سەرەدەرم لێ نەکرد. نووسراوەکان نە عەرەبی بوون ،نە فارسی ، نە لاتین ،نەژاپۆنی .چونکوو پیتە عەرەبی وفارسی و لاتینی یەکان دەناسموهێندەشم نووسراوەی ژاپۆنی لەسەر تەلەویزیۆن دیوە بەختی ئەوانیش کەوەک بۆق وقرژاڵ وجاڵجاڵووکە دەچێ ڕاهاتووم. پیتەکانی ئەم پەروەندە زۆرتر وەبزمار دەچوون کە لەتەنیشت یەک ریز کرابن وهێندێکیان کەوتبن .گوتم :

– چ تێی ناگەم ئەمە چ جۆرە نووسینێکە!؟

بزەیەک لێوەچرچەکانی لێک هەڵپچڕی .وردێک پێکەنی و گوتی :

– ئەم پەروەندەیە لە ژەمانی هەخامەنیشی یەکانەوە ماوەتەوە! کابرایەک بە ناوی "کامبوژیا" شکایەتی کردووە کەئیدارەی ژەنگەلبانی ژەمانی هەخامەنیشیان چونکە خانووەکەی چەن داری تێدابووە لێی زەوتکردووە و کارەکە دراوە بە دادگوشتەری وتائێستا پەڕوەندە هەر درێژەی هەیە."

پەروەندەی "کامبوژیا"ی هەڵگرتەوە وگوتی: "راوەشتە ، پەروەندەیەکی ژەمانی"خواژەنیژامەدینت" بۆ بێنم بزانە شخەبەرە! قەرارە ئەو رۆژانە کاری تەواو بێ!"

دەستم بۆلای راداشت و پاڕامەوە .

– باشە قوربان. باشە . بۆخاتری خوا مەیهێنە . دەزانم تائەمڕۆ شکات لێکرا– ویان نەدۆزیوەتەوە وهەر بەشوێنیدا دەگەڕێن!"

بۆ هەزارویەکەمین جار لە پلیکانی ئیدارەدا هاتمە خوارو چوومەوە چایخانەی گۆڕین. فەرمانی هەمیشەیی درا .

– کورە چایەکی جوان بۆ کاک هەمەوەند بەرە .قەنەی بۆتازە کەوە .بزوو!"

لەتەنیشتم پیرەپیاوێکی سەروڕدێن سپی وبەخۆوە لەگەڵ یەکی دیکە دانیشتبوون کەبەشێوە قسەکردنیان را مەنگوڕ یامامەش بوون. کاک "عەزیم"ی جیرانیشمان لە تەنیشتوانەوە خەریکی قەنەکێشان بوو . هەرکە چاوی بەمن کەوت پرسیاری کرد :

"کاک هەمەوەند" پەروەندەکەت چی لێ هاتەوە ؟

دەمم لەقەنە کردەوە و هەناسەیەکم هەڵکێشا و سەرگوروشتەی پەروەندەکەم لەنووکەوە بۆگێراوەو گوتم کە نامەوێ جی دی وەدووکەوم. کاک عەزیم هێندێکی دڵخۆشی دامەوە وسەرئەنجام گوتی کە کاری وا دەبێ بەخودای بسپێری وقەرزی وادەبێ بەبووی دابنێی . پیری سەروردێن سپی کەگوێی لەم وتووێژەمان هەڵخستبوو بە راوێژی شیرینی مەنگوڕی هەڵیدایە و گوتی :

– حەق دەبی بەدەستی خۆی بستێنی .دەڵێم ئەمە کاکە سوارێک بوو زوڵمیان لێ دەکرد وملکیان لێ داگیر کردبوو .زۆری هات وچۆی ئیدارەومیداران کرد چی بۆ نەچۆسەرێ .رۆژێکی دەستی دا گۆپاڵی وسەری دووانی شکاند .بەسەری توو ئاوە ئاوری داکرا .خودا وەت حەستێنی .لەکۆڵی بوونەوە و ملکەکەیان بۆبەجێ هێشت ."

ئەو نەقڵە وەک بروسکە– یەک ڕای تڵەکاندم .بەچاو تروکانێک گوڕام! بۆتائێستا بیرم لەوە نەکردبۆوە کەخۆم دەبێ حەقی خۆم لە "عەبە قاچاغچی" بستێنم!" قەنەو چام بەناتەواوی بەجێ هێشت ورۆیشتم .

لەماڵی عەبە رەژوور کەوتم .بەرەنگاری بووم ودەستم دا گۆپاڵێکی ویەکسەر وەبەر گۆپاڵانمدا :

ـ پووڵەکەم دەدەیەوە یان بتکوژم !؟

ئەویش بەجاو تروکانێک گۆڕا! ڕووجا، بەری وکەوتە لاڵانەوە ئەو زەبەلاحە وەک مێوژۆکە دەلەرزی. ئەژنۆی میراوە وبە عەرز داکەوت. ژن ومناڵەکەی هاواریان لێ بڵیند بوو.

ـ مەمکوژە! ئێمە کردمان ئەتۆ بەیکەی! غەڵەتمان کرد. بەگەورەیی خۆت بمان بەخشە. پولەکەت حازرە !

ـ هەرئێستا! هەرلێرە! دەنا هەموتان دەکووژم !

عەبەی چاوبەمۆلەق وەستاو بەلێوەلەرزەوە بانگی حێزانی کرد :

ـ دەبۆی بێنە. ژنەنیوە زووبە! بوەعەمر بووم! کاک هەهەمەوەند ،مەمەم کوکوژە! ژنە درگای سندوقێکی ئاسنی کردەوە وسەب هەزارتمەنی هێنا دەر. بۆی ڕاگرتم وگوتی :

ـ فەرموو ئەوە پووڵەکەت دەسەرت گەڕێم. وازێنە!

پووڵەکەم وەرگرت وپاشە پاش گەڕامەوە. سەی بەیانی زوو چوومەوە لای قاوەخانە. ئەمجار پێش ئەوەی قاوەچی دەستووری چاوقەنەم بۆبدا خۆم هاوارم کرد :

ـ کوڕە چایەکی میشوولە ـ دارم بۆبێنە وقەنەکەشم بۆ تازە کەوە! بزوو.

دانیشتم "عەبە"م دیت بەپێوە ڕاوەستاوە و چاوەڕوانە ئیزنی بدەم دانیشێ. بەدەست ئیزنی دانیشتنم پێدا ولاقم خستە سەرلاق وبەقوڵنەی قەنەم وەک کەڵەباب بەسەرمدا خوێند. لەدیتنی هەیکەلی داتەکاو و تێکشکاوی "عەبە" کەیفم

دەکرد. چاوی لەبەرم هەڵنەدە- هات وەک مەڕی گورگ دیتوو زمانی شکا بوو. چاوم لەسەر هەڵنەدەگرت. دەمزانی تیشکی نیگام وەک نووکە ڕمی تیژ لەگیان ولەشی رادەچێ. ئەگەر بەدەگمەن نیونیگایەکی دزانەی لێکردبام وچاوی بە چاوم کەوتبا وەک دەبنان گوێت سریواندبێ بەتوندی ڕووی وەردەگێڕا وسەری بەردەداوە. قزەبوو ،بەزیبوو!

پاش ئەوەی کەیفی خۆمبەو حاڵەتەی "عەبە" تەختکرد هەستام بۆئاخرین جار بچمە خزمەت دادیار وبایەگان کە یەکێک لە شکایەتکارەکان لێی پرسیم :

ـ کاک هەمەوەند ئەورۆ، زۆر بەکەیفت دەبینم. نەکا دادگا حەقی بۆ ئەستاندبی ؟

لەکاتێکدا چاوم لە عەبە نەدەتروکاند گوتم :

ـ بەڵێ زۆر سازم. حەقی خۆم لەم خوێڕی یە ئەستاندەوە بەڵام بەدەستی خۆم. دادگا چی بۆ نەکرا.

هاتە تەنیشتم وبە سەرنجەوە ڕووداوەکەی لێ پرسیم ومنیش لە نووکەوە بۆم گێڕاوە.

هەستا بە پەلە وەدەرکەوت. لەوکاتەدا بیری سەرووردێنسپی کەئەو دەرسەی پێدابووم وەژوورکەوت ولە تەنیشتم دانیشت. پاش چایی خواردنەوە وگەپێکی زۆر بۆم گێڕاوە کە منیش بەراستێکی کاکە سوارانە بەحەقی خۆم گەیشتمەوە. بانگ هێشتنم کرد شەو میوانم بێ.

بەشوێن پەروەندەکەمدا نەچوومەوە. لێی گەڕام تا ڕۆژبازاڕی قیامەت هەر بمێنێ. دەزانم لەوێ دادیار لەسەر ئەوەی کە حەقی منی نەستاندووە بە توندی سزادەدرێ ودەینێرن بەشوێن عەبەدا. ئەویش بەپەلە دەچێتە سەر قەبری عەبە ودەگەڕێتەوە خزمەت باریتە ـ عالا ودەڵێ "قربان عەبە در محل نبود!"

# شیعری ژاپۆنی

وەرگێڕان لەفارسییەوە
عەزیز ئالی

**شیعری ژاپۆنی " هیجایی" یە ، نەوەزنی هەیە نەقافیە**.بەحری بەرەواج"هایکۆ"یە کە لەحەڤدە هیجا پێک دێ .لەهایکۆ باوتر "تانکا"یە وبرێتی یە لە سی ویەک هیجا : رستەی یەکەم پێنج هیجا ،رستەی دووەم حەوت ، رستەی سێیەم پێنج ،رستەی چوارەموپێنجەمیش هەریەکە حەوتهیجایە .

تانکا یەک فکرێکی تەواو بەیان دەکا ، ناعیلاج لەم مەیدانە تەسکەدا ، قسەکورتە و پڕە لە ئیبهام وکینایە وئیشارە. بۆئەوەی مرۆ تێی بگا ،دەبێ فێری بێ ولێی رابێ و جودا لەمەش خێوی تەبعێکی رەوان بێ . زۆر واهەیە ،شیعرێکی کەناوی نیە خوێنەر دەمەعناکەی ناگا .

شاعیرێکی ئێرانی دەڵێ :"رەنگە بەعزێک لایان وابێ شیعری ژاپۆن زۆر سادەیە وپیاو دەتوانێ لە گۆشەیەک بۆی دانیشێ وبە پێنج دەقە ،یەک هەڵبەستێ ! بەڵام ئەوکەسانە هەڵەن چونکە شیعری ژاپۆنی چەندی بەدیمەن سادەبێ، سەدئەوەندە بەمەعنا گرانە .هێشتا مەزنترین هایکۆبێژی ژاپۆن "شووگی "یە کە پێنسەد و شێست ساڵ لەمەوبەر ژیاوە .شیعری ژاپۆن گوڵێکی گەش وبۆنخۆشە ،بەڵام ئەوپنجەی ئەم گوڵەی بەسەرەوە پشکووتووە ،ئاوپرژێنێک ئاوی نادا ،فەلسەفەی "ذن"[1]یاراوی دەکا " .

لەژاپۆن ،ژن وپیاوان ،پیرولاوان ،هەموو بەهەر بیانوویەک بێ ،شیعر دەڵێن.تەنانەت ساڵێ جارێکیش لە رۆژێکی دیارکراودا ، لە شاوەبگرە تاگەدا ،کۆدەبنەوە وهەرکەسەی هایکۆیەک دەڵێ .

کەسەروشادی ،ئاشتی وناتەبایی ،رۆیشتن و گەڕانەوە ،کارەساتی گرینگ وڕووداوی بچووک، هەرچی دڵی ئادەمیزاد بزێوێ ،بۆژاپۆنی هەوێنی شیعرە .بەتایبەتی شوێنێکی خەڵکی هونەرمەند قەتلە کیس خۆیانی نادەن، نوێنی سەرەمەرگە .لەم وەختەدا هونەرمەندی گیان ئەسپا[2]چی لە گەڕی رۆژگار دیوە و چەشتووە ،تێکی هەڵدەشێلێ وپوختەی دەکا وبە گیان ودڵ دەیسپێرێتە دۆست وئاشنایان . بە شیعری ئەودەمە دەڵێن "ژیسەئی" ،یانی گیان دەرچوون .

بەڵام ئەوشتەی دڵی مرۆی ژاپۆنی زۆرتر دەبزێوێ ،جیلوەی جۆربەجۆری تەبیعەتە : هەر نەخش ونیگارو ،رەنگ وبۆن و ،زمزەمەونالەیەی کەلەنێوان هەردوئاسماندابێ،ژێی دڵی ژاپۆنی دەخاتە لەرە .بەهاران کەئاسمان دەگری و زەمەند وبزوێن پێدەکەن ،هاوینان کە هەتاو بەرهەمی کوێرەوەری دەکا بە زێڕ،پایزان کە رەشەبای دڵڕەش دیمی[3]زەردی رۆژگار دەڕنێ، زستانان کەدنیا سەرهەڵدێنێ وبەفری لە پرچی شەورەنگ جوانتری پەرێشان دەکا،ژاپۆنی دڵی لە لای خۆی نیە ،لە نێو تەبیعەتدا ون بووە و وێڕای دەشت وچیا و شینکەوئاو دەورێگێنێ .

حا لەبەر ئەمە ،دەرگای ئەم ساعە لە

ژاپۆنی نەبێ لە کەس ناکرێتەوە .ئێمەش بە سروەیەک رازی دەبین وە بۆن وەرامەی چەند گولاّن واز لەم گولستانە دێنین. بەلاّم وەرگێران دوژمنی جوانیە .قسەکە ئەوەندە ناسکە ،هەر کە دەستا ودەستی کرد دەژاکێ:

( سپێدە )[4]

ئای کە هەتاو
دەشتی رۆژهەلاّتی چ جوان رازاندەوە !
بەلاّم تا ئاورم دایەوە
مانگ داچووبوو !

* * *

( گولّ چنین )

بۆ چنینی گولّ
دەچیمەن کەوتم !
لە کۆشی گولّدا
شەو تا بەیانی
بەمەستی خەوتم !

* * *

( هەوری رەش)

ئەو هەورە تاریکەی
بەسەر چیاوەیە ،
ئاهی دلّی منە
دنیای داگرتووە ! (٥)

* * *

( بەیادی فرزەند )

پێش پشکووتنت ،دەسووتام لەسوێت
کاتێک پشکووتی ،رەشم کردە بەر
ئەی سپی گولّەی وەک مانگی چاردەم
چت بۆمن هەبوو ، لە کەسەر بەدەر؟

* * *

(١) ذن :عیرفانی بوودایی .

(٢) گیان ئەسپا : کەسێکی هاتبێتە حالّی جاو ( محتضر . جان آهنگ ) .

(٣) دیم : روخسار

(٤) سپێدە : بەیان

**لەسەر کەلّەزەنگی[6] مەعبەد**
**پەپوولەیەک**
**چەند بەخۆشی لێی خەوتووە !**

* * *

( ؟ )

رێم نیە تا خۆشەویستەکەم ببینم
ئەرێ دەبێ بۆهەمیشەوەک دوندی کێو
وەک دوندی "فووجی" لە "سوورگا" ،
هەر بسووتێم ؟!

* * *

(٥) : لەگەلّ ئەمشیعرە کوردی یە پێکیان بگرە :
**هەر تەمێ لەسەر شاخێ ساکنە**
**ئەوە تەم نیە هەناسەی منە!**

(٦)کەلّەزەنگ : زەنگی گەورە (ناقوس) .

## هونەر و هونەرمەندانی کوردستان

٧

هونەرمەندی لێزان وکەم وێنەی کوردستان "قالەمەڕە" یەکێکە لەو دوندە سەرسپی یانەی هونەری گەلی کورد، کەبەداخەوە هێشتا بەتەواوی نەناسراون. جا بۆیە بە پێویستمان زانی تا زووە بچینە دیتنی ئەم هونەرمەندە "شمشاڵ ژەن"ە و وتوویژێکی لەگەڵ بکەین. وا لە خوارەوە بەشێکی وتوویژەکە کە رۆژی ٦٥/٦/٢٠ لە شاری بۆکان کراوە، دەخەینە بەرچاوی ئێوە.

– پێشەکی سپاس و داوای، لێ بووردنتان لێ دەکەین کە ئەرکی ئەم وتوویژەتان قەبووڵ کرد.

**– ئەمنیش مەمنوونی ئێوەم کە بەسەرتان کردوومەوە، پایەدار بن.**

**پرسیار:** حەز دەکەین سەرەتا لەناوی تەواوی خۆتەوە دەست پێ بکەین وبزانین لە سالێکدا ولەکوێ چاوت بەدنیا هەڵێناوە ؟

وەڵام: بەخودای کاکەگیان من سیننم (تەمەنم) ئەورۆکانە شێستە. ئەڵبەتە لە دێی "کولیجە"ی بەوەڵەد بووم، ئەوەشم بۆ مەعلووم نیە ساڵی چەند وتەئریخی چەند بوو، چونکە ئەوزەمان عالەم هێندە هوشیار وبەئاگا نەبووە تاکوو لەسەر شتی خۆی بڕوا، مەسەلەن لەسەر شۆرەت ونێو وزیندەگی و هەموو نەقڵەکەی خۆی. عالەمی ئەورۆش لەسایەی خولایەوە بڕێک هوشیارو بەئاگا بۆتەوە ودەشزانێ لەگەڵ خەڵکیش بدوێ ودەشزانێ لە هەموو کارێکدا بە حیسابی بجووڵێتەوە ودەشزانێ بە سەربەرزانە داوای هەق و ماڵ وشتی خۆی بکا. ئەورۆ ئاوایە.

ئەوزەمانیش ئاوا نەبوو. نێوی تەواوم "قادری عەبدولڵا زادە"یە بابم نێوی "محەممەد"ە وبابرسم نێوی "عەبدولڵا"یە. بۆخۆشم ئەڵبەتە لەقەبم "قالەمەڕە"یە

پرسیار: لەچەند ساڵێنەوە دەستت بەشمشاڵ لێدان کرد و خەریکی ئەم هونەرە بووی ؟

وەڵام: لەحەوت ساڵەگی یەوە ئەمن دەستم بەو شمشاڵەی کردووە. بەکوڵلی ئەمن دەستم لێ هەڵنەگرتووە. کوتوویانە لە هەرجێ یەک کەسێک چوار ئاهەنگان دەزانێ خۆم گەیاندۆتێ هەتا سیننم گەیشتۆتە ئەو شێست ساڵەی. ئەلعانیش پێ یەوە دەگەڕێم بەخولای نەکەس هەیە بتوانێ

ده‌که‌ڵم بلێ ،نه‌که‌س هه‌یه ب‌توانێ شمشاڵم له‌گه‌ڵ لێ بدا.

پرسیار: کام شمشاڵ ژه‌ن و هونه‌رمه‌ندی کوردستان کاری کردۆته سه‌ر هه‌ست و سۆز و به‌هره‌ت؟ چه‌ند ئاوازی میللی به شمشاڵه‌ت لێده‌ده‌ی؟

وه‌ڵام: مامێکی خۆم که‌نێوی "ره‌حمانی عه‌بدوللازاده" بوو له "کولیجه"ی داده‌نیشت ،مام

برایم "برایم‌شه‌م"یان پێ ده‌کوت ، هه‌رله کولیجه‌ی داده‌نیشت ،ئه‌ویش شمشاڵی جوان لێده‌دا .مامم و ئه‌و مام برایمه ،ئه‌ودوانه یه‌که‌مین ئوستادم بوون .

یه‌ک مامم ، یه‌ک برایم شه‌م، یه‌ک "غه‌فووره خره"ی کۆزه‌ی ،ئه‌وانه ئوستادی من بوون .هه‌تا ئه‌وان مان له‌کن ئه‌وانم لێده‌دا ، له‌کن ئه‌وان فێربووم. ئه‌گه‌ر ئه‌وانیش ئه‌مری خولایان کرد و مردن ،وه‌ڵا ئیدی ئه‌وجا بۆخوم ده‌ستمدا شمشاڵی وپێوه گه‌رام هه‌روا شاره‌وشار ودێ ودێ . ئه‌که‌ر رادوێ داکه‌وتن، له رادوێی تاران ،رادوێی کرماشان ،رادوێی مه‌ریوان رادوێی سنه ،رادوێی قه‌سری شیرین ،رادوێی گورگان ئه‌له‌وانه هه‌موو رادوێکان ده‌چووم وشمشاڵ تۆمار ده‌کرد

هه‌تا (ته‌نانه‌ت)رادوێی ئیسفه‌هانێ ،رادیوێی یه‌زدێ ، ئی بافقێ .

که ده‌ڵێی چه‌ند ئاوازی میللی به شمشاڵه‌که‌ت لێده‌ده‌ی وه‌ڵڵاهی پێموایه ئه‌گه‌ر له‌کن خولای نه‌بێته درۆ ، هه‌ج هه‌وای له دنیایه ئه‌گه‌ر له زاری به‌شه‌ری بێته ده‌رێ ، ئه‌من ده‌یزانم، جا هه‌تا شیعر ،

گۆرانی ، نورحان خوێندن ، مه‌سه‌له‌ن شیعری مه‌ولوودنامه‌ی سلاوات ، هه‌رچی ئاهه‌نگی هه‌یه ونیه ئه‌من ده‌یزانم وعاسێ بوونم نیه.ئیدی ئه‌گه‌ر له ئاهه‌نگانیش ده‌پرسی، ئه‌گه‌ر دابنیشم لێی ده‌م ،یه‌ک کاتیمه ویه‌ک حه‌رفی ناهێلم غه‌لته‌ت بێ ،ئه‌وه‌ش ئاهه‌نگه‌کان . هیج ئاهه‌نگێک له‌چنگ من عاسێ نه‌بووه وعاسیش نابێ، بلێی عاسێ بێ .ئه‌گه‌ر شماره‌ی ئاهه‌نگانم لێ بپرسی و

( بلێی) چه‌ند ئاهه‌نگان ده‌زانی ؟ ئه‌وه بۆلێ پرسین نابێ ،کاری له هه‌زاریشدا نیه .هه‌رچی به‌شه‌ر له‌زاری بێته‌ده‌رێ ،ئه‌من ده‌یزانم. جا به‌هه‌ر له‌ون ولوغه‌تێکی بێ ، به‌عاره‌بی بێ ،به‌تورکی بێ،به فارسی بێ ،به‌کوردی بێ،ئه‌من ده‌یزانم وبۆی مه‌حته‌ل نابم. ئه‌وه‌ش ئه‌من ونه‌قڵی ئاهه‌نگ

زانینێ .ئه‌وا ئاهه‌نگێکیشت شمشاڵ بۆ لێده‌ده‌م ........

هێندێک له‌و ئاهه‌نگانه‌ی ئه‌م هونه‌رمه‌نده به‌شمشاڵ لێی داون وله‌سه‌ر شریت زه‌فت کراون :

کاکه‌مه‌م وخاتووزین فۆلکلۆر .

گه‌لۆ ـ فۆلکلۆر .

ئایشه‌گوڵ ـ فۆلکلۆر مه‌قامی ،"سێوه"ی خۆشخوان .

پیره‌هه‌ڵۆ ـ مه‌قامی کاوه‌یس ئاغا .

قه‌ڵای دمدم ـ فۆلکلۆر به‌یت .

رمبازێن ، هه‌وای بووک گواستنه‌وه ـ فۆلکلۆر .

هه‌وای جۆپی ـ فۆلکلۆر .

ته‌یری گه‌رمێن ـ فۆلکلۆر .

هه‌واری ترکانه ـ فۆلکلۆر ، به‌یت .

هه‌وای حه‌یران ـ فۆلکلۆر .

خانباجی ـ فۆلکلۆر .

**پاشماوەی سەروتار**

سالیان درازی بهاء حکومت نامردان بی دین بود. همانها که شرافت انسانی درنزدشان مفهومی نداشت وبرای عیش و نوش بیشتر زندگی را بکام هزاران مردو زن و کوچک و بزرگ تلخ کرده بودند. بله دوسالی که برای تاریخ مادوقرن ودوهزار سال بود. اما در این دوسال سراسر تلاش چیزی وجود داشت که بارسنگین کارو مشکلات را بمیزان بسیار زیادی قابل تحمل میساخت وآن چیزی نبود جز احساس رضایت ،پشتگرمی وانتظار شما مردم خوب وگرامی. هر چند شما درنامه‌های زیاد وپرمهرتان افتخار راه‌اندازی این حرکت عظیم فرهنگی را به ما نسبت داده وشرمنده‌مان ساختید اما باید اعتراف کرد که اگر حمایت، تشویق و محبت شما نبود، هرگز این "شجره طیبه" به بار نمینشست. ما در قبال این همه لطف و صمیمیت شما چیزی نداریم تا تقدیم کنیم جز آنکه تمامی توان خودرا در راه شکوفایی هرچه بیشتر این نونهال مقدس بکار بندیم. روزیکه کار را آغاز کردیم انتظار نداشتیم که در فرصت کوتاهی بتوانیم نشریه‌ای با این کیفیت وکمیت ارائه دهیم. درنخستین شماره، وقتیکه دوره ابتدائی کار آغاز شده بود با استقبال بی نظیر مردم خوبمان مواجه شدیم وهزاران جلد "سروه" درمدت کمی نایاب شد. سروه چون موجی بزرگ منتشر شد، از مرزها گذشت وبوصال دوستداران خود در نقاط مختلف کشور ودر بسیاری ازکشورهای دیگر رسید پی انتشار اولین شماره "سروه" کاروان تبریکات، پیامها و مقالات واشعار به سوی مرکز نشر براه افتاد. کاروانی که ازهر شهرو روستا واز هر کوی وبرزنی مسافرداشت. کاروانی که "محبت" "صمیمیت"، "حمایت"، "تشویق"، "همکاری" وانتظار برای آینده‌ای بهتر و روشنتر" مسافرانش بودند وبر ما بود که ازاین همه مهمان عزیز پذیرائی کنیم. اما مگر میشد بادست خالی، امکانات کم وکمبود تجربه پاسخگوی آن همه احساسات پاک بود؟

وهمه اینها درشرائطی تحقق میافت که کمترین تبلیغی برای آن صورت نگرفته وهنوز بسیاری، از انتشار آن بی اطلاع بودند. اینجابود که سنگینی بار را که بردوش داشتیم صدچندان احساس کردیم وباخود عهد بستیم که تابرآورده ساختن آرزوی تاریخی مردم خوبمان دست ازتلاش برنداریم. **استاد وپرچمدارمان که خدایش رحمت کند، پیوسته درحالیکه اشک چشمانش باستقبال این حرفش میرفتند، میگفت:**

**که اگر عمری از من باقی است دراین راه گذاشته‌ام. در**

ازخدا مدد جستیم و با بهره‌گیری از هدایای معنوی خوانندگان پرشور ودلسوز نست به تهیه مطالب شماره دوم اقدام کردیم باتوجه به وضعیت موجود مطمئن بودیم که کمترین فاصله زمانی ممکن تا چاپ نشریه دوم، چیزی در حدود، سه ماه خواهد بود. لذا تصمیم

گرفتیم که تا حصول شرائط مناسبتر نشریه بصورت فصلی ارائه گردد. بدین ترتیب نشریات بعدی یکی پس از دیگری منتشر گردید.

فقدان استاد هیمن در آستانه یکمین سال تولد "سروه" رکود چشمگیری درکار ایجاد کرد که بلطف الهی وبا همت دوستان وخوانندگان عزیز نشریه پنجم باکمی تاخیر ودرتیراژ بسیار زیادی منتشر ودرمدت کوتاهی کمیاب شد. درحالی که همه ما درتلاش برای بهبود اوضاع وتقویت بنیه کاری بوده وباخود عهد بسته بودیم تا نشریه فصلی را قبل از اتمام فصل بدست خوانندگان محترم برسانیم با مشکل کمبود کاغذ وزینک دربازار مواجه شدیم وبدین ترتیب متاسفانه علیرغم همه تلاشهایی که برای سرعت بخشیدن به کار صورت گرفته بود ،نشریه ششم دیرتر از همیشه بدست خوانندگان رسید

به هردو بسیار امیدواریم) عزم جزم کرده‌ایم که انشاءا... ، سخن برگردد وآن اینکه بواقع ،موجودیت "سروه" وتما ــ

وباتوجه به انتظار طولانی که برای آن کشیده شده بود درمدت کوتاهی نایاب شد وما ناچار به تجدید چاپ این شماره شدیم. دراین اثنا هفتمین شماره "سروه" تولد یافت ودستان خوانندگان پر مهر ودوستدارانش را بوسید و اینک آخرین شماره ازسال دوم را دردست دارید که امیدوار- یم دیر بدستتان نرسیده باشد.

غنیمت فرصتی است تا نسبت به تمامی کاستیها و نواقص ازشما پوزش بخواهیم. همچنانکه پیشتر آمد درسباط ما چیزی که جبران کننده حمایتهای شما باشد نیست جز آن که تمامی توان خود را برای هرچه بهتر ارائه کردن "سروه" بکار گیریم. دراین راستا گر توفیق خدا همره وحمایتهای بیدریغتان ادامه داشته باشد (که البته

ازسال جدید-ازشماره نهم به بعد) سروه را ماهانه کنیم. این اقدام هرچند با توجه به وضعیت کنونی ما بزرگ مینماید اما در برابر سیل تقاضاهای مکرر وبسیار زیاد کتبی ،شفاهی وتلفنی شما،کمترین وظیفه‌ای است که انجام آنرا برخود لازم میبینیم. بدین ترتیب سروه ماهانه منتشر خواهد شد البته هرچند ممکن است کاهش فواصل زمانی انتشار مجله به تقلیل درصفحات آن بینجامد ،لکن با برنامه‌ای که دردست اجراست تلاش میشود که با افزایش قابل توجه کیفیت وتنوع هرچه بیشتر مطالب(ضمن حفظ فرهنگی-ادبی بودن مجله) به درخواستهای خوانندگان ارجمند پاسخ مثبت داده ودعوت بحقشان را لبیک گوئیم. خامه سخت مایل است که مجددا" به رکن اصلی

**امروز به فضل ایزد منان وبه همت دوستداران فراوانش "سروه" در هر کوی و برزنی و هر صدرو مخزنی خانه کرده و زیباتر از همیشه تاریخ ظلمت وسیاهی را چلچراغی روشنگر ودره‌های سرد و دوردست را بلندآفتابی گشته است. امروز بحث از سروه نقل هر مجلس ومحفل فرهنگی در داخل و خارج است.**

میت این نهضت مقدس فرهنگی به‌عنایت وحمایت شما بستگی مطلق دارد. امروز برهمه بویژه بردست اندرکاران انتشار "سروه" بسیار روشن است که این حرکت عظیم قائم به‌شخص ویا اشخاص ویژه‌ای نیست وسرچشمه اصلی حیات آن، قلوب مردم پاک، عاشق وبی آلایشی است که هویت انسانی خودرا در قبال هجوم فرهنگی غرب وشرق زکف نداده وخودرا نباخته‌اند.

اینان لزومی به‌معرفی ندارند اینان درجای جای خاک پاک کردستان، معارف اصیل وناب را ازگذشته‌هایی دور، درصندوق سینه‌هایشان ازتاراج روزگار محفوظ داشته‌اند. استادان بزرگ فرهنگ وادب کردی که خدایشان حافظ باشد درشکل گیری وتداوم این جهاد مقدس نقش تعیین کننده داشته‌اند. اما آنچه که آنها راهم به‌حرکت وامیدارد وبه جسم نحیف وکهولشان جانی نو وروحی پرطراوت وبانشاط میبخشد علاقه، مدد وانتظار قلوب، دستان وچشمان مردم، است. اساتید واقعی همارە سوژه‌های شعرو ادبشان را از داستان راستان رنج وتلاش، راحتی وفراغت، فرازونشیب وبالاخره سرنوشت غمانگیز ویا مسرت بخش همین مردم گرفته‌اند وچندان خود را در زندان خیالات واهی واباطیل ذهنی محبوس نکرده‌اند. جان کلام آنکه این گمان که بین سونوشت این حرکت وسرنوشت افراد مخصوصی پیوندی وجودی برقرار است اهلیت خطا دارد...

رحلت ناگهانی استاد فقید هێمن درشرایطی اتفاق افتاد که باراطلی کار بردوش این پیر بود اما چنانکه خود پیش بینی میکرد وهمه ما به چشم دیدیم پس ازفقدانش نه‌تنها کارها نخوابید بلکه موج توفنده احساسات وحمایتهای گسترده مردم وفادار به‌این انقلاب اصیل فرهنگی امکان داد تا در نخستین شماره از"سروه بی استاد"، علاوه برپیگیری روال گذشته با افزودن ویژه‌نامه ازخادمی که جانش رادر راه خدمت به مردم، میهن ومکتبش فدا کرد قدردانی گردد وبدینسان حیات "سروه" ادامه یافت.

امروز به‌فضل ایزدمنان وبه‌همت دوستداران فراوانش "سروه" درهر کوی وبرزنی وهرصدرومخزنی خانه کرده و زیباتر از همیشه تاریخ ظلمت وسیاهی را چهلچراغی روشنگر ودره‌های سردو دور دست را بلند آفتابی رخشان گشته است. امروز بحث از سروه نقل هر مجلس و محفل فرهنگی درداخل وخارج است.

وه که چه‌گران مسئولیتی است پاسداری ازدستاوردهای این جنبش شکوهمند وچه سنگین باری است این کوله انتظار همه تاریخ راکه همهمه سروشی تنها ودررویا را، یارای حمل آن نیست که‌حمل آن جزبردوش همه و جز به‌جوش همه ممکن نخواهد بود

"خداوندا نگه‌دار از زوالش"

**این گمان که بین سرنوشت این حرکت وسرنوشت افراد مخصوصی پیوندی وجودی برقرار است اهلیت خطا دارد.**

# سۆزی شکسپیر

عەزیز کەیخوسرەوی

شەکەت وشەمزاو لەگەشت وسەیران،بەلەزوبەز لەجێ خزام ،تالەو جەزرەبەوئازارەی لەشمی پرووکاندووە رزگار بم ،چونکە پاش ماندووبوونی لەش نۆرەی فڕینی مەلی خەیاڵە ،رووحم لە نیشتەجێی تاراوگەکەم وەک پارێزکارێکی زیارەتچی هانای هێناوەتە رووگەی شۆخ وشەنگی پڕلە شادی تۆ .

چاوی خەوالووی لەشەوگاری دەیجوور یدا کە هەرێم و هەڵبژاردەی کوێرانە ،ئاواڵە راگرتووە ،بەڵام من لەوتار- یکایی یەدا بەچاوی دڵ جوانیت دەبینم کە وەک گەوهەری شەوچرا بەشەوەزەنگی گۆڕئاسا دەدرەوشێتەوە و دیمەنی شەوی رەش بەجوانی بێ وێنەت رووناک دەبێتەوە .

گراوی خۆشەویستی من ! ئێستا پاش ئاگاداری بەرۆژ جەستەم بەجەزرەبەی کاری

بگەن .

ئەودەم یادی ئاواتە قڕکراوەکان لەخۆمم وەڕەز دەکەن ،لەنەکاو وێنەی خەملێوی تۆم بەدڵدادێ ورۆحم وەک بەرەبەیان کەچاوی بە گزینگی هەتاو بپشکوێ سۆزەی شادی هەڵدەکاتێ . لەهەردی تەماوی ومۆن بەرەوئاسمانی ساو هەڵدەکشێ، سروودی هیواو تاسە زەمزەمە دەکا ، چون ئەوکاتە بەیادی ئەوینی بێ وچان دەپرووکێ ،بەشەویش رۆحم لەتاوی ئەوینی بێ گەردی تۆ گلاراویەتی .

کاتێک لەدەست بەختی رەشی خۆمولەچەری خەڵکی سەرزەوی لەسووچی تەنیاییدا رەهێڵەی ئەسرین دەبارێنم ، لەتاوی چارەنووسی پڕخەفەتم پڕبەدڵ هاوار دەکەم ،وەختێک لەجەوری گەردوونی دەست درێژ - کەر کەگوێ نادا تەزایەڵەی ناڵەی بێ سوودو پسانەوەم ، سکاڵا دەکەم ،رۆژگاری کزی و بێ تینی خۆمم وەبەرچاو دێتەوە ونفرین بۆچارەنووسی کلۆلم دەنێرم .

ئاواتەخوازم وەک بەختە- وەران هیوا لەدڵی خۆم بەدی بکەم وئاوالان بەدەوروەمەوە ببینم .ساتێک ئاواتی پڕهەستی هونەروەران بەدڵ دەخوازم ئیرەیی بەبەختی ئەوانە دەبەم کە دەتوانن سووک و هاسان بەهەموو دڵخوازەکانیان تۆم ،ئەوەندە خۆم بەتەیار و دارا دەزانم کە پلەی بەرزی هێژاییم لەگەڵ جێگەی هەموو میرەکانی سەرزەوی ناگۆڕمەوە

کاتێک بیرەوەری رابردوو لەدڵی کرۆکپمدا! زیندوو دەبێتەوە ،گڕی هەناسەی بەسۆم بەیادی ئاواتە نێژراوەکانم ئاگر لەهەناوان بەردەدا ،پەژارەی دەورەی رابردووم زیندوو دەبنەوە بەچاوی پڕفرمێسک یادی ئەو

خۆشەویستانە دەکەم کە لەمێژە بوونە دیلی شەوی بێ برانەوەی نەمان .

بیرلە پەژارەی ئەوینی خاک کراوان وئەودڵدارە خۆشەویستانە دەکەمەوە کە پەچەی قورسی نیسانیان بە سەردا کشاوە ،جەزرەبەکانی مێژووی دووردرێژی ژیانم دێنەوە سوێ.بێ هیواوژاکاو خولیای چارەڕەشی یەکانی رابردووی ئۆگر بەئەوینی ئاگرین لەپێش چاوم رێچکە دەبەستن.سەرنج دەدەمە دەریای پڕشەپۆلی ئەو فرمێسکانەی رشتوومن ،دەڵێی هێشتا دەس قەرزی ئەسرینە ـ کانی ژیانم نەداوەتەوە وسەر لەنوێ لێمشتی ئەسرین دەبارێنم .بەڵام نەشمیلانەکەم ئەگەر لەوماوەدا یادی تۆ لەرووپەری خەیاڵمدا بێ ، باری پەژارە لەدڵم کۆچ دەکا چون هەست بەوە دەکەم کە لە ژیانمدا هیچم لەدەست نەداوە .

زۆر جارم کازیوەی بەیانی دیتووە کە بەنیونیگای بلاوێنی دەڕوانێتە لووتکەی چیاکان .جارجار بەلێوە ئاڵتوونی یەکانی خۆی چیمەنی سەرسەوزو رازاوەی ماچ کردووە ،بەتەلەسمی سیحراوی خۆی ئاوەمەندەکانی زێروەشان کردووە .

زۆرجار دیتوومە هەوری رەشی دزێو دیمەنی رووناکی هەتاوی ئاسمانی حەشارداوە و نەیهێشتووە رۆژی روون خۆ بنوێنێ ،تالە شەرمەزاری "ئاکاری نالەباری ئادەمیزادی سەرهەرد"رووی زەوی دڵتەزیو دابپۆشی ولەئاسۆی رۆژئاوا ئاوابێ .

هەتاوی ئەوینی منیش وەک بەرەبەیانی کورت لە ئاسۆی ژیانمدا درەوشا و تەوێڵی منی بەگزینگی دلڕفێنی خۆی رووناک کرد ، بەڵام بەداخەوە! سەردەمی ئەوتیشک هاویتنە کەمماوە بوو ،چونکە هەورێکی رەش رۆژی روونی گرتبووە باوەش هێشتا بەوحاڵەشەوە نەیتوانی جێ بەئەوینی من لێژ بکا ، چون باش دەیزانی کە تیشک هاویتنی رۆژی رووی هەردیش وەک خۆری ئاسمان کەمماوە و بێ دەوامە

خۆشەویستی بەسەر چاو و لەشمدا زاڵ بووە. وەها لە ناخی دڵمدا ریشەی داکوتاوە کە هەتوان بۆسارێژی ئەم ژانە بەدی ناکەم. بەلای خۆی کەس لەمن جوانترنیە ، لە هەموان رێک وپێکترم، کردەوەم لەگشت کەس باشترە. پەیتا پەیتا وەک پیاوێک کەلە دوورەوە بڕوانێتە من ولە هەموو ئەندامی لەشمدا جگە لەجوانی بەدی ناکا ، چۆنەتی بێ گەردیم بۆچاوەکانم شی دەکەمەوە .

بەڵام هەرکە چاوم بڕی یە ئاوێنە وخۆم ئاوا پرووکا و پڕگنج ولۆچ تێدا دیت ئەو هیوایەی بەخۆم هەیە بە شێوەیەکی تر هەست پێدەکەم. جاوەختێک ناتوانم دیمەن و قەڵافەتی ژاکاوی خۆمم خۆش بوێ بەجوانی تۆهەڵدەڵێم بەوەبیرهێنانەوەی رەنگ و رووی جوانی تۆ بەتەمەندا ـ چوونی خۆم لەبیر دەبەمەوە .

کاتێک چرای ژیانم هاتە کزی وورده ورده لە سووتان کەوت وبەیەکجاری کوژاوە ، کەڵەزەنگی بێ فەڕودڵتەزێن

لەزوور سەرمەوە دەزرینگێتەوە
بۆهەموو جیهان هەواڵ دەنێرێ
کە کەسێک لەم دنیا دزێوە
کۆچی کرد تا لە نێو گۆڕی
رەش لەشی ئامێتەی کرمی
دزێوتر لە دنیا بێ .
بۆنەمانم شیوەن مەگێڕن ،
تەنانەت بەخوێندنەوەی
شیعرەکانم مەلی بیروهۆشتان
بۆلای خاوەنەکەی نەفڕێ،چون
ئەوەندم خۆش دەوێن نامەوێ
دڵی پڕلە ئەوینتان سەبارەت
بەمن ناسۆرەکەی تەشەنە
بێتەوە .
کاتێک کە لە گۆڕی سارد و
تنووکم رادەکەن ودەڕواننە
ئەم شیعرە بێ بایەخەم ناوی
منتان بە زاردا نەیە با
ژین ئەوینم وێکرا ماڵ
ئاوایتان لێ بکەن، ئاگایان
لەشین و شەپۆڕتان نەبێ .
ئەی هەوێنی خۆشەویستی !
پار لە دووریت ج زستانێکی
ژاراویم رابوارد،ج سەرما و
سۆڵێکی زێدەلە وزە، لە
رۆحمدا هەستپێکرا،ج رۆژگا-
رێکی لێل وویلم بەشەوگاری
پڕ شەوەزەنگەیاند ، چەند
خەفەتی پایز بەسەر ژیانمدا
زاڵ بوون،دیسانیش وەرزی
دووریت زستان نەبوو،هاوین
بوو.هاوینێکی رازاوە و
دووگیان لەیاری ئەویندار ی
بەهار وەک ژنێکی شوومردە
چاوەڕوانی لەدایک بوونی
منالٚ بێ وپایزی پڕپیتی
پەروەردە بکا .
بەڵام ئەودووحاڵی یە بۆ
من بێ سەمەر بوو بەرهەمەکەی
ئەوینێکی ناڕەوا بوو چون
هاوین وخۆشی یەکانی لە لای
من بەشێکە لە وجوودی تۆ .
ئەگەر بارگەت بۆ هەوار تێک
بنێی مەلە دەنگ خۆشەکان لە
جریوە دەکەون،ئەگەر جار
جارەش بجریوێنن ئەوەندە بە
سۆز وکوڵە وخەم و خەفەتی
لەگەڵە کە گەڵای دارستان
هەست بە مەترسی زستان
دەکەن ولەتاوان زەرد هەڵدە-
گەڕێن .
ئازیزەکەم: تۆقەت لە لای
من پیر نابی ،تەبیعەت
ناتوانێ جوانیت بەتالان
بەرێ. چون ئێستاش وەک
هەوەڵین نیونیگای چاوەمە —
ستەکانت دلڕفێن وبێ گەردی .
ئێستا سێ ساڵ رادەبرێ
سێ جار زستانی ساردوسڕ
جل وبەرگی رازاوەی هاوینی
دارستان ولێرەواری داڕنیوە .
سێ جار خەزەڵ وەر جێی بە
خوناوەی سەرسەوزی بەهاری
لێژ کردووە .سێ جار هاوینی
گەرم بۆنی گوڵاوی مانگی
بانەمەڕی لەباغ وگوڵشەن
بەتالان بردووە وبۆن وبەرا —
مەی گوڵانی گرتووە .
لەوماوەیەدا چوزە خەڵفی
ساوای تۆ هەروا سەرسەوز و
گەش وبۆن خۆش وگوڵاو پژێنە .
سەرەڕای ئەوانە ،جوانی
وەک ئەقرەبەی سەعاتلە
سەر سەفحەی ژین دەخولێتەوەو
ئەو ژمارانەی رابواردنی
تەمەن پێشان دەدەن هەڵدە
بوێرێ .
راستە جوانی تۆ دەگۆڕێ
بەڵام هەروا تەڕوپاراوە .خەتا
لەچاوی منە کەلە ئاستئەم
راستی یە کزوبێ سوێیە .
ئەگەر وابێ ئەی رۆژگاری
داهاتوو کە هێشتا چاوت بە
دنیا نەپشکووتووە ، باش
بزانە بەرلەوە کە تۆ بێی
یەکێک ماڵ ئاوایی لە ژیان
کرد کە شۆخ وشەنگی یەکەی
بەقەد جوانی هەموو
دلڕفێنەکانی سەر زەوی بوو.

هەبوو نەبوو کابرایەکی فەقیر بوو ماڵێکی خشپیلانە وجوانی بوو .شەوێکی دز لێی وەژوور دەکەوێ ،مجری یەک و لەتکە بەرەیەکی دەبا .کابرا وەخەبەردێ و وەدووی دزەی دەکەوێ دەیگرێتەوە . دەیباتە کن پادشای .

پادشای ئەو شارەش زۆربێ ئاقڵ دەبێ . قەرەوڵ ئیجازەی دەدەن ودەچێتە بارەگایە .. دەڵێ :

ـ جەنابی پادشای ئەوکابرایە دوێنێ شەوێ خۆی دەماڵەمن هاویشتووە هەتا دزیم لێ بکا ئەمنیش گرتوومە وهێناومەتە خزمەتت .

پادشا روو دەکابرای دەکاو دەڵێ :

ـ کابرا ئەتۆ بۆچی چووی دزیتلەوماڵەی کردووە ؟

کابرا دەڵێ :

ـ قوربان خەتای من نیە .خەتای خۆیەتی بۆخۆی دیوارەکەی کورتسازکردووە . بۆچی دیوارەکەی قولەسازکردووە هەتا من بتوانم پێیدا وەسەر کەوم .ئەگەر ئەو دیوارەکەی هێندێک بلێندتر کردبایە ئەمن نەمدەتوانی پێیدا وەسەر کەوم‌ودزیم پێ نەدەکرا .

پادشا بە کابرای دەڵێ :

ـ راستدەکا کابرا ئەتۆ بۆ دیواری ماڵەکەت نەوی سازکردووە ؟

کابرا دەڵێ :

ـ پادشا سلامەتبێ خەتای من نیە .خۆ بۆخۆم سازم نەکردووە .وەستا سازی کردووە . خەتای وی یە .

پادشا نۆکەران بانگ دەکا ودەڵێ :

ـ هەر ئێستا بڕۆن وەستای جەلب کەنە ئێرە !

نۆکەر دەچن لەهەرکوێ یەکی بێ ،وەستای دەگرن .قۆڵبەستی دەکەن ودەیهێننە خزمەت پادشای .پادشا دەڵێ :

ـ کابرا ئەتۆ ماڵە ئەوکابرایەت بۆ خرا کردووە ؟

ـ قوربان ئەمن بۆ خرام کردووە ؟

ـ ئەدی خراکردن چۆن دەبێ ؟ ئەوەنیە دیوارەکانت نەوی سازکردوون ،دز توانیویەتی وەسەر کەوێ ؟

ـ جاقوربان خۆئەوە خەتای من نیە !

پادشا دەڵێ :

ـ ئەدی خەتای کێ یە ؟

ـ پادشا سلامەت بێ ،ئەوە خەتای خشت بڕی یە .ئەو خشتەکانی چکۆڵە ساز کردوون . دەنا رەگەکانم لەفێتی خۆی داناوە .

پادشا نۆکەران بانگ دەکا ودەڵێ :

ـ هەرئێستا بڕۆن خشت بڕی جەلب کەن و بەشەقان بیهێننە ئێرە .با هەردووک چاوی دەربێنم جارێکی دیکە نەخەڵەتێ خشتی چکۆڵە ببڕێ !

نۆکەر دیسان وەڕێ دەبن ،کەم دەگەڕێن ، زۆر دەگەڕێن ،خشت بڕی دەبیننەوە . ئەویش قۆڵبەست دەکەن ووەپێش خۆیانی دەدەن بۆ بارەگای پادشای .پادشا دەڵێ :

ـ کابرا بڵێ بزانم بۆچی خشتت چووکە بڕیوە ؟

ـ بۆچی جەنابی پادشای ؟

ـ چۆن بۆچی ؟ ئەتۆ خەیانی ،خشتت چووکنە بڕیوە ،وەستاش دیواری پێ داناوە ،دیوار کورتی هێناوە .دز توانیویەتی پێیدا وەسەر کەوێ ودزی لەماڵە ئەو کابرایە بکا .

خشت بڕ کە دەبینێ پادشا زۆر نەفامە و ئەگەر بیانوویەکی سازنەکا ، سەری بەفەتەڕات دەچێ کەمێک فکر دەکاتەوە ودەڵێ :

ـ پادشا سلامەت بێ خەتای من نیە .

پادشا دەڵێ :

ـ ئەدی خەتای کێ یە ؟

خشت بڕ دەڵێ :

ـ خەتای دارتاشە .ئەوقالبی خشتەکانی چکۆڵە ساز کردووە وئەمنیش بەقەت خۆی قورم

تێکردووە وخشتەکان چکۆڵە هاتوونەدەر .دەبێ دارتاشی سزا بدەن .

پادشا نۆکەران بانگ دەکا ودەڵێ :
– لە عەرزی بێ ولە عاسمانێ بێ دارتاشی ببیننەوە وبیهێننە ئێرە . ئەوە گوناحبارم دیتەوە .جاخۆم زانی وئەو !
نۆکەر بێرەوبەوێدا وەحەولەوەلا دەکەون. کەم دەگەڕێن زۆر دەگەڕێن ،دارتاشی دەبیننەوە .بە هەمان تەرتیب ئەویش قۆڵبەست دەکەن ودەیبەنە خزمەت پادشای .
پادشا رووی تێدەکا ودەڵێ :
– کابرا ئەتۆ خەتاباری .
– پادشا سلامەت بێ گوناحم چیە ؟
– چۆن گوناحت چیە ؟ قالبەخشتت چووکە سازکردووە .خشت بڕ خشتی چکۆڵە بڕیوە .وەستا دیواری پێدانا وە ودیوار کورتی هێنا وە دز توانیویەتی پێیدا وەسەرکەوێ . ئێستا ئەتۆ گوناحباری .کوڕە داوەرن بیبەن دەستی ببڕن باجارێکی دیکە کاری وانەکا .
دارتاش دەڵێ :
– پادشا سلامەت بێ ئەگەر دەستم ببڕن کارم پێ ناکرێ ،کۆشێکم مندالی سەروپێچکە هەیە ،هەموو لەبرسان دەمرن .
پادشا دەڵێ :

– باشە ئەوە بەخشیمی دەستت ناپەڕێنم . کوڕە وەرن بەرن چاوێکی دەرێنن .
– پادشا سلامەت بێ. ئەمن هەردووک چاوم دەوێ .دەبێ بە دووچاوان تەختەکە خەتکەم هەتا قالبەکان تەواو بێنەدەر ئەمما راوچی وەختی سێرەگرتنێ هەر چاوێکی هەڵدێنێ وچاوێکی دەقووچێنێ .ئەو چاوێکی لازم نیە دەستوور بدە بچن راوچی بێنن وچاوێکی دەرێنن .
پادشا نۆکەران بانگ دەکا ودەڵێ :
– هەتا لاسمێلێ راستەم بادەدەم راوچیم بۆلە بارەگایە حازر کەن !
نۆکەر بەلینگ دان دەڕۆن.وبە وڵاتیدا بلاو دەبنەوە. زۆر دەگەڕێن ،کەم دەگەڕێن ، راوچی دەبیننەوە. قۆڵبەستی دەکەن یاڵڵا بۆ خزمەت پادشای !
پادشا دەڵێ :
– کوڕە راوچی ؟ دارتاش قالبدخشتی چکۆڵەی سازکردووە وخشت بڕ خشتی چکۆڵەی بڕیوە ،وەستا دەکاری کردووە ، دیوار کورتی هێنا وە ،دز وەسەری کەوتووە وچۆتە مالە ئەو کابرایەی . جادەبێ چاوی دارتاشی

دەرێنین ئەمما چونکوو بەچاوێکی کاری
پێ ناکرێ دەبێ چاوی تۆ دەرێنین .ئەتۆ
وەختی راوی چاوێکت دەقووچێنی .

ـ پادشا سلامەت بێ .راستە ئەمن بۆ راوێ
چاوێکم دەقووچێنم ئەمما بۆ دیتنەوە و
شوێن هەلگرتنی هەردووک چاوم دەوێ.جا بۆ
چاوی دەرکەوانی خۆت دەرناهێنی ؟ ئەو بە
چاوێکیش دەتوانێ بژی .

پادشا دەرکەوانی بانگ دەکا ودەڵێ :

ـ کورە ئەوە راوچی دەڵێ ئەمن بە-
چاوێکی ناژیم .ئەتۆ بە چاوێکی دەژی و
دەبێ چاوێکت دەرێنین .

دەرکەوان دەڵێ :

ـ جا قوربان ئەگەر چاوی راستم دەرێنن
لای راستە نابینم .ئەگەر چاوی چەپم
دەرێنن لای چەپە نابینم ئەدی ئەوە هاتوو
جەنابت لەلای چەپەڕا بانگت کردم خۆ ناکرێ

جوابت نەدەمەوە !

پادشا ئیدی وەڕەز دەبێ ،خەوی دێ دەڵێ :

ـ ئەدی چاوی کێ دەرێنم ؟

دەرکەوان دەڵێ :

ـ چاوی ئەوکابرایەی دزی لێکراوە .

پادشا دەڵێ :

ـ جا ئەو بۆ؟

دەرکەوان دەڵێ :

ـ چونکوو بۆ لەتکەبەڕەیەکی ئەو
هەلالایەی ساز کردووە ،

پادشا سلامەت بێ لەتکەبەڕەیەک ئەوە ـ
ندەی دێنێ ؟

پادشا دەڵێ :

ـ ئافەریم بۆ ئاقلت .ئەتۆ لە سبەینێ ڕا
وەزیری دەستەراستی .

دابگرن چاوی راستەی ئەوکابرایەی دەرێنن !
کابرا دزی یان لێکردبوو .پاش ئەو هەموو
ماندوو بوونەی چاویشیان دەرێنا !

ئەمنیش لەولاڕا هاتمەوە . کالەمدڕا ، چم
پێ نەبڕا .

# ئێمە و خوێنەر

نامەودیاریەکی زۆرمان لە لایەن خوێنەرانی خۆشەویستەوە بۆ هاتووە کە نیشانەی رێز و حورمەتی خوێنەرانی بەڕێزە بۆ سروە و کاربەدەستانی.

هێندێک لەونامانە لە بەشەجۆرواوجۆرەکانی سروەدا جواب دراونەوە وهێندێک جوابی تایبەتی یان بۆبەڕێ کراوە ،دیسانیش پێ رانەگەیشتووین جوابی هەموو نامەکان بدەینەوە ولێرەدا ناوی دەستەیەک لەم خۆشەویستانە کە نامە و دیاریان گەیشتووە دەنووسین وهیوادارین لە داهاتوودا بە هەموو شێوەیەک کەلک لە دیاریەکانیان وەربگرین و جوابیان بدەینەوە.

لێرەدا تکا لە خوێنەران و لایەنگرانی خۆشەویستی سروە دەکەین ئەم چەند خاڵەی خوارەوە وەبەرچاو بگرن.

١ـ لەم وتارانە کە بۆ ئێمەی دەنێرن، نوسخەیەک لای خۆیان رابگرن، چونکوو نووسراوەکانیان لەئارشیوی سروەدا هەڵدەگیرێ وناتوانین بۆیان بنێرینەوە.

٢ـ نووسراوەکان بەخەتێکی خۆش لە دیوێکی کاغەز بنووسن

٣ـ ناونیشانی خۆیان لە کۆتایی نامەکانیاندا بنووسن

٤ـ سەرچاوەی نووسراوەکانیان (ئەگەر تەرجومە و ئیقتیباسە) دیاری بکەن.

٥ـ نووسراوەکان بە رێنووسی سروە بنووسن.

٦ـ نامەووتاری بێ ناو و نیشان جواب نادرێتەوە ،ئەگەر کەسێک نایەوێ ناوی بڵاو بێتەوە بەنازناو وتارەکەی بۆ بڵاو دەکرێتەوە.

سروە

**پیرانشار:** رەحیم موجاویری محەممەدئەمین ئاگووشی ـ محەممەدئەمین عەبدوڵڵازادە ـ قادر پیرەمێرد ـ رەحیم باپیر پوور ـ سەیدسمایل سەیدشوکری مستەفا محەممەدی ـ مستەفا عەزیزی ـ م. پەرێشان ـ وەستا محەممەد ـ قادر قادری ئەقدەم محەممەدئەمین مودەریس چەختی ـ محەممەد غەفووری ـ عومەر پالیش ـ محەممەدئەمین سەیدعەبدوڵڵاهی ـ رەسووڵ محەممەدی ـ زوراژ مەنگوڕی.

**سەقز:** عەلی بەهرامی ـ جەلال رەحیمی ـ ناسرئاغابرا ـ مستەفا حوسێن پوور ـ مەحموود حاج رەحیمی ـ هومایوون ئەحمەدی ـ حامید خاکی ـ ناسر خادمی ـ محەممەد سەدیقی ـ فاتح حەیدەرنیژاد ـ سەیدئاغا محەببەت ـ رەسووڵ عەزیمی ـ عەلی ئاغابرا ـ سەلام سوارە ـ محەممەد ئەبولمحەممەدی ـ عەلی پەناهی ـ ئازادە فەرزانە.

**بۆکان:** ئەمیر محەممەدی ـ سەلیم سالح زادە ـ تاها حوسێنی ـ شەریف عەرەبی ـ سەیدعەبدوڵڵا خوسرەوزادە ـ محەممەد حەبیبی ـ فەرهاد شەریف نیژاد ـ عومەرحسامی ـ شۆڕش شەریفی ـ حامید ئەحمەدی ـ فەتاح شەریفی ـ محەممەد ئێلخانی زادە ـ ئەبووبەکر سالحیان ـ یوسف مستەفا ـ ئیسماعیل پوور عەبدوڵڵا ـ محەممەد ئەیکان ـ ئەمیر حوسێنی ـ محەممەد رۆستەمزادە ـ سولەیمان مرادی بێهزاد کۆچەری ـ ئەحمەد مەولانی ـ ئەحمەدگروە ـ عومەر سوڵتانی (وەفا) ـ محەممەد رەسووڵ بولەند گڕامی ـ غەمبار ـ ئازاد پیرۆتی.

**مەهاباد:** کاوەئاهەنگەری ـ

کەریم ئەرشی ـ قادر ساسا
میری ـ رەحیم بەهرامی ـ
ساکار ـ قادر محەممەدی ـ
عەبدورەحمان شەنگە ـ کەریم
رەسوولپوور ـ ئیسماعیل
بەختیاری ـ ئەسعەد بیرشتی
سامەکی ئەنسارییان ـ ئەسعەد
بریاحە ـ جەعفەر رەحمانی ـ
بروسکە ئیسماعیل زادە ـ
محەممەد موهاجری ـ رەسووڵ
شەنگە ـ فەرهاد جیهان میهەن
ئەحمەد ئەبووبەکری ـ حەمە
باعەوان .

**سەردەشت** : عەبدوسەلام
حەفیدی ـ بەشیل ـ رەشید
ئازەریار ـ حوسێن سەحسەبوور
سەیدتاهیر ئەبووبەکری ـ
وشیار شەیبانی ـ محەممەد
ئەحمەدی ـ عەلی هەڵۆیێ ـ سەید
عەزیز حوسێنی ـ سەعید
رەمەزانی .

**قوروە** : رەحمان ئارمەند .
**سەرپوڵی زەهاو** : رەحمان
ئارمەند .
**ئیلام** : سەید لەتیف
قادرزادە و باقی هاوڕێکانی
**رەوانسەر** : دلێر میرزا .
**میاندواو** : سولەیمان
بێبەش ـ یاسر مەعرووفی .
**مەرگەوەڕ** : خالید سارم ـ
عەبدوڵڵا شەریف ـ حەسەن
مستەفاپوور .
**خۆی** : حدر مەولوود
رۆستەمی .
**سمنان** : بەختیار عەبدوڵڵا
بەرزەنجی .
**ساوە** : رەشاد رووستایی
مستەفا مامەندچومانی .
**تەوریز** : عەبدوڵڵا زێڕین ـ
سەعید محەممەدزادە ـ عوسمان
قادری .
**تاران** : بیکەس .ع ـ
محەممەد ساڵح ئیبراهیمی
محەممەد حوسێن مەولایی ـ ساڵح
عەتاری ـ عەبدوڵڵا کەریمی
تاهیر فەتاحی .
**ورمێ** : سەلاح یوسفی .
**ئەهواز** : سمایل قەزاق .
**بووشەهر** : سەلاح عەرەبی .

**شنۆ** : محەممەد پوورحەسەن .
کەریم خاڵ ئاغایی ـ مستەفا
رەسووڵی ئازەر ـ ئەحمەد
رەحمانی ـ ئاری سولەیمان
هیرانی .
**نەغەدە** : مراد قادری ـ
رەسوول قادری ـ سمایل
عەزیزی ـ حدر بەهرامبەگی ـ
عەبدولواحیدشوکری ـ سەباح
ئەوبندار ـ کەمال تەلا ـ دیاری
عەفووری ـ عەبدوڵڵا حەسەن
زادە ـ ئاوات ئەقراری ـ
عوسمان ئەحمەدی ـ سەیدجەمال
شوکری ـ خالید فەتاحی ـ
قادر موزەفەری .
**بانە** : عەتا قازی زادە ـ
ر. ئازاد ـ ئەحمەد ئەمینی ـ
ئەمیر محەممەدی ـ عەبدوڵڵا
عەباسی ـ مەلاسابیرعیراقی ـ
حوسێن بەفرین ـ سەیدمحەممەد
بەرزەخ ـ رەئووف محەممەدی ـ
حەلیل ئازادیخواز .
**سنە** : محەممەد زەمان شا
مرادی ـ فایق یوسفی ـ
عەبدورەحمان مەردووخ ـ م .
عەربی ـ سیاوەش ئەردەڵان ـ
میرزا هەورامی ـ جەلال
گەویلی ـ سەید فەیزوڵڵا
سەحادی ـ حامید کەریمیان ـ
حەسەن رەحمانی ـ تۆفیق
ئیبراهیمی ـ محەممەد رزگار
سیراجەدینی .
**باختەران** : شکووە
کەهریزی ـ ئەحمەد شەریفی ـ
جەلال حوسێنی ـ حەسەن
عەزیزی ـ مەحموود دەبیر
فەلەک .
**مەریوان** : عوسمان سادقی
محەممەد میهری ـ جەلال
ئەسکەندەری ـ سەلاح محەممەدی
مدریک کازمی ـ شلێر خالید
پەنا ـ شنۆ خالیدزادە ـ جەمیل
ئەحمەدی ـ کامران مەجیدی
نیزام تاهیری ـ محیەدین
قەلعی ـ جەمال سابیر ـ خالید
رەئووفی ـ ناسر ئازادەگان ـ
ماکوان کازمی ـ زرێبار
فایقی ـ ئەحمەد زەمانی ـ
محەممەد زەمانی ـ محەممەد
کەریم سەدیق پوور .
**کامیاران** : ساڵح گیلاسی .
**نۆدشە** : خالید ئەحمەدی .
**پاوە** : باقی سەفاری .
**ئاڵمانی رۆژئاوا** : رەهبەر
ڕیزان .
**یەکەتی سۆڤیەت** : خالید
نوورەدینی .
**ئامریکا** : کورمانج .
**ئوتریش** : پاراو .
**هولەند** : حەمەی مام
ئەوڕەحمان .

؟:مرادعەزیزی ـ حیکمەت ـ کوردستانی ـ ج.م. شەمزاو ـ م. عەبدولخالەق .

**سوید:** مەریوان مەحموود کاوە شێخانی ـ دانا ئەحمەد سالح .

**ئیسپانیا:** عەزیز ژیان .

**ئوروپا:** س.م.غ ـ نوو ـ سینگەی تارا ـ پاکیزە سالح ـ نەهری شیروانی ـ

**دەستەی نووسەرانی سروە شوینەواری ئەم ئازیزانەی پەسند کردووە وبە نۆرەی خۆی لە ژمارەکانی داهاتووی سروەدا چاپیان دەکەین .**

محەممەد سەدیقی ـ عومەر فارووقی ـ عەلی بەهرامی پەرویز کەیخوسرەوی ـ سەلاح عەرەبی ـ سەید عەبدوڵلا سەمەدی ـ فارووق وەفایی عەلی کەریمی ـ رەسووڵ رەش ئەحمەدی ـ سەید محەممەد سەمەدی ـ حاجی رەئووف سەلیمی ـ مستەفا رەسوولی ئازەر ـ مەناف مەولوودی ـ عەلی خانی ـ ئەبووبەکر ئەمیری رەسووڵ خدری ـ محەممەد سووتانی ـ خالید دەیلەمی سمایل قەزاق ـ حەمیدمەحموود نەزمی ـ سەیدخدر میرسەیدی محەممەد عەلی قادری ـ مستەفا شێخە ـ رەئووف محەممەدپوور چالاک ـ راوچی ـ عەبدوڵلا مودەریس ـ عەلی نانەوازادە جەعفەر روحی زاد ـ سیاوەش موکری ـ تەها قادر سپیکەیی عەبدوڵلا ئەحمەدی ـ ئەدیبە ئازاد ـ نەسرین توڕابی ـ سەلام سەرایی ـ عەبدوڵلا غەفاری مستەفا عەتار ـ مام ئەوین سمایل رەحمانی ـ عەبدوڵلا وەکیلی ـ سەدیق سەفی زادە بۆرەکەیی ـ رەحیمزادە محەممەد حوسێن پوور ـ مستەفا ئێلخانی زادە ـ یۆسف ئاشنوی مەحموودزادە ـ رەحمان حاجی سەلام سوارە ـ خالەق عەلی ـ مەحموود شکاک نژاد ـ قادر فەتاحی قازی ـ محەممەد سالح ئیبراهیمی عەبدولحەمید حوسێنی ـ محەممەد رەئووف تەوەکولی ـ عەبدولخالەق ئەبازی ـ عەبدوڵلا سیراجی ـ ئورغان غالب ئەحمەد شەریفی ـ محەممەد ئێلخانی زادە ـ کەریم ئەسغەری رەشاد حوسێنی ـ عەبدوڵلا زێرین ـ دوکتۆر ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم ـ فەرەیدوون ریشقان ـ سەباح بەرزەنجی مەلارەشید قەرەنی زادە ـ مەلا عەزیز محەممەدپوور ـ حەلیل ئازادیخواز ـ محەممەد ناسر سیمای ـ فازل سەعید ـ محەممەد بەهرامبەگی .

سەیدمستەفا زمزیری ـ حوسێن بەفرین ـ مەلا رشید بورهانی ـ رێبوار نەبەز ـ عەزیز عەزیز نژاد ـ قادر ئەحمەدی ـ نادر مستەفازادە ـ یۆسف فەتاحی قازی ـ رەسوول قادر نوور عەبدوڵلا مێمەندی پوور ئەحمەد مەولانی ـ مەلامحەممەد عومەری ـ عەدنان زەبیحی ک.د. ئازاد ـ مەلا مەحموود ئیبنولحەیات ـ سەلاح یوسفی حوسێن تەلەنگ ـ فایق یۆسفی ئەحمەد حاجی ئیسماعیل زادە بوران ـ عوسمان حەسەنی سمایل بەزاز ـ عەبدولقاسم بانە ـ جەلال قادر ـ محەممەد رەئووف تەوەکولی ـ رەسوول وەیسی ـ عەزیز کەیخوسرەوی گۆیژە زەنگەنە ـ مەزن زەنگەنە و...

**سەقز ـ** هومایوون ئەحمەدی :

برای بەڕێز، ئەم هەموو لوتف ودلسۆزی یە هانمان دەدا حەول بدەین بلەی گۆوارەکە ـ مان بتر بەرز بکەینەوە.

شیعرەکەت لاوازە. هیواداریں زیاتر حەول بدەی.

**نەغەدە ـ** سەیدکەمال شوکری :

کتێبی مێژوویی لەبارەی کوردستاندا، زۆرن و لە کتێبخانەش دەست دەکەون.

کورد گەلێکی ئارییە و بە دەسیسەی ئیستیعمار و بە هۆی بەزانی وحەیاتەت، بەشێکی زۆری کەوتە بەردەستی تورکی عوسمانی وعەرەب.

لەگەڵی یەکی زنجیرە چیای (ئاسلی) . لە ناوچەیەکی سەرسنووری ئێران، بەردێکی تەختێک گەورە لە کەناری رووبارێک هەڵکەوتووە.

چەند ساڵێک لەمەوبەر یەکێک نووسینێکی لەسەر ئەم بەردە هەڵکەندووە تا ئێستاش بەچاکی دەخوێندرێتەوە، رۆژگار نەیسڕیوەتەوە ودیارە ناسڕێتەوە .

حەڵکی دەوروبەری ئەم چیایە ئەفسانەیەک لەبارەی ئەم بەردە دەگێڕنەوە، دەڵێن گوایە کابرایەک لەژێر ئەم بەردە نێژراوە بەڵام کەس ناوی لەیاد نەماوە. کاتی خۆی راوکەرێکی بەناوبانگ بوو هیچ باڵندەودڕندەیەک لەبەردەستی قوتار نەدەبوو بەڵام لەبەر ئەوەی چاوچنۆک و بەرچاوتەنگ بوو هیچ پشوودانی نەدەزانی .

جارێکیان بەزنەکەی گوت: "ئەمن بە کوشتنی بزنەکێوی یان دڵم داناکەوێ دەمەوێ بە زیندوویی بیانگرم!" .

چووەشاخان ونێری یەکێوی یەکی شاخ زلی کوشت و کەوڵی کرد وچووە نێو کەوڵەکەی و وای لێ هات کەس نەیدەزانی نێری یەکێوی نیە. کە خۆی بەم چەشنە گۆڕی بە دزە دزە لە کێوی یەک نزیک بۆوە. ئەوڕۆژە دنیا تەم ومژ بوو ،کێوی یەکان لە فێڵی نەدەگەیشتن ، هەر هێندەی مابوو بکەوێتە نێو رەوەکەو دەستی خۆی بوەشێنێ لەو کاتەدا بە هەڵکەوت راوکەرێکی تریش لە چیای (ئاسلی) دەسووڕایەوە . تفەنگی بەدەستەوە بوو . کە چاوی بەو نێری یە گەورەیە کەوت زۆر شادودڵخۆش بوو . لە دڵی خۆیدا گوتی :

"ئەمکێوی یە زۆر زلە بە گوللەیەک ناکەوێ!" .

ئەوە بوو دووگوللەی گەورەی خستە بەرتفەنگەکەی و ئاگری دا . هاوارێکی بەسام لە هەوادا دەنگی دایەوە . راوکەر رایکردە سەر نێچیرەکەی ،بینی کابرایەکە خەڵتانی خوێن بووە .

راوکەر سامی لێ نیشت و هاواری کرد :

"ئەوە تۆچت لەخۆت کردووە تۆ بۆچی منت تووشی ئەم تاوانە کرد؟" .

کابرای نێوپێستی نێری یەکە بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە وگیانی دا .

ئیتر کابرایان لەدەم رووبارەکە ناشت وئەوراوکەرەی کە کوشتبووی ئەم نووسینەی لەسەر کێلی گۆڕەکەی هەڵکەند

"ئەوەی پێستی خۆی بگۆڕێ دوو گوللەی بەردڵ دەکەوێ" .

بەردەکە ئێستاش لەدەم رووبارەکەیەوهەموو جارێ کە بۆراو دەچمە ئەم گەڵی یە نووسینەکەی سەری دووبارە دەخوێنمەوە .

# گرانەتێ

«هێرش»

زانستی-تێکنیکی

گرانەتێ یا کەوتوویی نەخۆشی یەکی وەگر (موسری) و چڵکن (عفوونی)ە. میکرۆبەکەی لەنێو چێشت وسەوزی و ئاودا دەژی. ئەم میکرۆبە بە زاردا دەچێتە نێو لەش. گرانەتێ زۆرتر لە بەهار وهاوین و پایزدا دادەکەوێ بەڵام بە زستانیش دیتراوە. ئەم نەخۆشی یە لە هەمووتەمەنێکدا بەسەر مرۆدا دێ بەڵام زۆرتر زارۆک ولاو دەیگرن.

## نیشانەی گرانەتێ

ماندوویی، سەرئێشەی زۆر گرفتی (قەبز بوون)وجار و بارەش زگەشۆرە، خوێن ڕێژی دەم، ئاوسانی ریخۆڵە.

لەسەرەتای ئەم نەخۆشی یەدا دەرەجەی تێ دەگاتە (٣٨) و زانەسەرو قەبزبوون وزگ چوون وکۆخەش دەست پێدەکا. دەتوانین بڵێین گەورە وبچووک بە سێ جۆران تووشی ئەم نەخۆشینە دەبن:

١- عەوارزی دەزگای هەزم، کە رەنگە نەخۆش تووشی تێ وزگەشۆرە ورشانەوە بێ.

٢- عەوارزی ئەعساب، کە نەخۆش تووشی زانەسەروگرفتی (قەبزبوون) دەبێ.

٣- عەوارزی دەزگای هەناسەدان، کە کۆخە و برۆنشینی لەگەڵە.

لە هەرسێ جۆردا دەرەجەی تێ دەگاتە (٣٨) وهێدی هێدی دەچێتە سەر (٤٠). بە معایەنەی نەخۆشان دەرکەوتووە کە گازێکی زۆر لە نێوریخەڵۆکە کۆدەبێتەوە وسپڵ (طحال) یش دەپەنمێ ولەئەندازی خۆی گەورەتر دەبێتەوە. لەئاخری هەفتەی هەوەڵدا، زگ و رانی نەخۆش زیپکە دەردەکا کە ئەویش وردە وردە لەبەین دەچێ. لەهەفتەی دووەمدا میکرۆبی گرانەتێ کە رەگەڵ رەوەندی خوێن کەوتووە لەوانەیە زۆرجێگای نێو دەزگای هەزم بریندار بکا. لەبەر ئەمە دەبێ چێشتی ئاوەکی بدرێ بە نەخۆش، چونکە خواردنی رەق یا پەیت دەبێتە هۆی خوێن ڕێژی یاکون بوونی ریخۆڵە.

عەوارزی دیکەی نەخۆشی گرانەتێ بریتین لە:

ئاوسانی پەردەی دڵ. سەرهەڵدانی زیپکەی کێماوی لە پەدەن یا مۆخی ئێسک، چڵک و ژان کردنی گوێچکە وئێشانی گورچیلە.

ئەم نەخۆشی یە (١٥) تا (٢٠) رۆژان دەخایەنێ. هێندێک جاران پاشەوەی ئەم پەتایە بۆ دوکتور دژوارە ودەبێ خوێنی نەخۆشەکە تاقی بکرێتەوە.

## گرتنەوەی گرانەتێ

١- گرتنەوەی راستەوخۆ.
٢- گرتنەوەی ناڕاستەوخۆ.

## راستەوخۆ

ئەو کەسانەی دەست لە

جل وبەرگ وجێگاوبان و شتومەکی ئالوودەی نەخۆش دەدەن،پێویستە بەرلەوەی کە دەست بۆ دەمیان بەرن بە ئاوی گەرموسابوون بیشۆنەوە .

لە ولاتی ئێمە بۆ کوودی سەوزی وتەرەکالّ و... زۆرتر کەلک لە بیسایی ئینسان وەردەگرن.دیارە بیسایی نەخۆشانیش لەگەڵە وەربۆیە سەوزی وتەرەکالّ ئالوودە، دەبن وئەوکەسانەش کە بە نەشۆراوی دەیخۆن تووشی گرانەتێ دەبن .ئاوی پیسیش میکرۆبی گرانەتێ لەگەڵە ، چونکە هێندێک کەسی بێ خەبەر جل وبەرگ وقاپ وکەوچکی نەخۆش لەجۆگە و دەراوان دەشۆن .لەوانەیە شیری پاتاڵ وئاژاڵیش میکرۆبی ئەم نەخۆشی یەی لەگەڵدا بێ ، چونکە رەنگە دەستی شیردۆش ئالوودە بێ وشیرەکەش ئالوودە بکا . بەعزە شیرفرۆشێکی قازانج پەرستیش لەوانەیە ئاوی پیس بکەنە شیرەکە و دەرخواردی خەلکی بدەن و نەخۆشیان بکەن .

١- خۆبواردن لە خواردنی سەوزی وتەرەکالّی نەشۆراوە ، بەتایبەتی لەکاتی بلاوبوونەوەی ئەم نەخۆشینەدا . سەوزی و تەرەکالّ بەرلە خواردن دەبێ بەئاوی خاوێن بشۆرێتەوە ، پاش ئەمە چەند دەقیقەیەک بخرێتە نێو مەحلوولی پرمەنگەناتی دوپۆتاس ودوایی بە ئاوی خاوێن بشۆرێتەوە ، ئینجا کەلکی لێ وەربگیرێ . ( گرەمێک پرمەنگەناتی دوپۆتاس بۆ دە لیتر ئاو) .

٢- خۆبواردن لە ئاوی جۆگە وچەمی نێوشاروعەنباراو. ئاوی کانی وئاوی دەستلێ نەدراو بێ زیانە . لەهەرەتی بلاوبوونەوەی گرانەتێدا واباشترە بۆشکاندنی تینوێتی ،چای کەمرەنگ یا ئاوی کولێوی ساردەوەبوو بخۆنەوە .

٣- دەبێ هەموو کەس نینۆکی خۆی بکاو دەست و چاو بەسابوون وئاو بشوا .

٤- ئەگەر لەماڵێکدا کەسێک تووشی ئەم نەخۆشی یە هاتدەبێ تا زووە لەوانی دیکەی هەلاوێرن وقاپ وکەوچکی بۆ جودا بکەنەوە و جێگەکەی پاک وخاوێن رابگیرێ .

٥- لە هەموو شتێک باشتر ئەوەیە کە مندالّ بە دژی میکرۆبی گرانەتێ بکوترێ (واکسینە بکرێ) تا ئەم نەخۆشیەزۆر پەرە نەگرێ . واکسەنی گرانەتێ ئامێژەنی میکرۆبی تیفۆئیدوپاراتیفۆ-ئیدە کە بە گەرمایی زەبوون کراون .بەلام ئەگەر منداڵێک سیل و تێ و نەخۆشی قەند (دیابێت)و عەواریزی گورچیلە ودلّی هەبێ ،نابێ واکسەنی گرانەتێی لێ بدرێ .

٦- کە گرانەتێ بەسەر ماڵێکدا هاتدەبێ دەستبەجێ بێهداری ئاگادار بکا تا پیاوی بێهداری بنێرن کەل وپەلی نێو ماڵەکە "ضدعفونی" بکەن .

نابێ چێشتی پەیت بدرێتە نەخۆشی گیرۆدەی گرانەتێ . تەنیا دەبێ شتی تراو بخوا. کاتێک نەخۆش ژانەسەر و زگ ئێشەی بێ ئەگەر کیسەی سەهۆڵ لەسەر زگ وسەری دابنێدرێ .ئەگەر نەخۆش دلّی لەخێلّەکەوە بێ( زەعف بکا ) وفشاری خوێنی کەم بێ دەکرێ لەدەوای تەقویەتی دلّ وەک (کامفر) کەلک وەربگرێ .ئەمرۆ ئیدی گرانەتێ دەرمانی هەیە و نەخۆشان زوو خۆش دەکاتەوە .

## مەتەڵ

چەرم و ئاسن و کودولە
وێی دەخەن رەشی دوولا
سەرگەورە کردیە قوولە
" خەرەک "

بەخێشەوە بە مێشەوە
بە خالەقی دەروێشەوە
پەنجەی تەواو لە پاشەوە
پانیەی تەواو لە پێشەوە
" کوللە "

لە بەفری سپی تره
لە قیلی رەشتره
لە وشتری بڵیندتره
لە پشیلەی نەویتره
" قەلەسابوونە "

لە ئاسمانێ تەبەق تەبەق
لەسەر عەرزێ کوچک و کەڵەک
بەخێر هاتی عەبا بەڵەک
" لەک لەک "

ئاردی هاڕیاو
ئاش نەدیتوو
" بەفر "

چوار مەڕ و شوانێک
حەوشێک و بانێک
" دەست "

هەر دەڕۆی و بەجێی دێڵی
هەر دەڕۆی و دەگەڵت دێ
" نیسی "

# پەندی پێشینیان

★هەموو داعبا گۆشت خۆرە .
هەر ناوی گورگ بە دناوە .
★شین و شایی دەستەوایە
★ناکەسان مەکە بەکەس
کەسان مەکە بەناکەس
★لە دووی چوان مەڵێ ئاخ
کوێرەکانی یان مەکە باخ
★سووک بڕۆ، سلامەت وەرەوە
★سەر چاوەی چۆمی درۆ نزیکە
★قەت خوێن نابێ بە ئاو
★قەت رابردوو لە بیر مەکە
★کەس بە خەیاڵ نەبووە بە ماڵ
★هەر کە گلۆڵەت کەوتە لێژی
کەس چاکەت نابێژی
★تا لەپی دەستت رەش نەبێ
تامی زارت خۆش نابێ
★زەرەر لە نیوەش را
بگەڕێتەوە هەر باشە
★میوان جێژنی خانە خوێی یە
★دز بازاڕی ئالۆزی دەوێ
★زمانە!، ئامانە!
هەتا ئەتۆم بی جیرانە!
ڕەحەتێ نابینم لەژیانە!
★کەس دۆستی تێ شکاو نیە
★هەر عەقڵەی لە خەسارێکی
★گەورە ئاو دەڕژێنێ
چکۆڵە پێی تێدەنێ
★زۆر گوتن قورئان خۆشە

* ئاگر ب ئاڤی دتەمرە .
* ئاگر ئاڤی نادە سەر شوون.
* ئاگر بدارین هوور هلکە .
* ئاگر ل قورما دمینت.
* ئاگر هندی گەش بە ،
گرار هندی خوەش دبە .
* ئاگر دۆست و دوژمنا ناس ناکە . .
* ئاگری گوڕ زوو دتەمرە .
* ئاگری کو دینەک هل کە .
سەد عاقل نەشین بڤەمرینن.
* ئاگر هل نەکە دووکەلا وی بی بکەڤە چاڤی تە .
* ئاگر را نەلەیزە تی بشەوتی.
* "مومی" ئاگر بەردا کومی، خوەدا سەری زومی..

کابرایەک دوو دوگمەی گەورە دەباتە لای خەیات و دەڵێ :
ـ کاکە زەحمەت نەبێ باڵتۆیەکم بۆلەم دوگمانە بنێ !!

لێرەدا سپاسی کاک مەحموود شکاک نژاد ،چەحشەمزاو، دژوار خالید عەزیز ،عوسمان حاجی ،غەمبار ماژگەیی،زریان محمد کاکەیی ،خوشکە ئەختەری شێخەلیسلامی، ئازاد عیسا سەید ئیسماعیل سدید شوکری وئەحمەد بەحری دەکەین کە بۆرا زاندنەوەی ئەم بەشە یارمەتیان داوین.

کابرایەک دەچێتەلای سەرتاشێک ،سەری بتاشێ . کابرا ئەوندەی ئازار دەدا وئەملاو ئەولای سەری دەبڕێ لە تاوان نازانێ چی بەکابرا بلێ دوایە کابرای سەرتاش دەلێ :

ـ کاکە بێ قەیدی بێ ئێوە چەند بران

دەلێ :

ـ ئێمە ئێستا لە مالی خۆمان سێ برابن،ئەگەر منیش بە ساغی نەجاتم بێ دەبینە چوار .

زیندانی یەکەم :چەندساڵێت زیندان بۆ براوەتەوە؟

زیندانی دووەم : هیچ سەعاتێکشم زیندانی ناکەن

زیندانی هەوەڵ : ئەدی ئەگەر زیندانیت بۆ نەبراوەتەوە بۆ لێرەی؟

زیندانی دووهەم : مەحکوومی بە ئیعدام بووم !

دەگێڕنەوە لە ئاوایی یەک کابرایەک دوو تەغار گەنم بە یەکی دیکە قەرزدار بوو بەلام لەوانە بوو حاشا بکا و نەیداتەوە . کابرای خاوەن قەرز لێ بڕاو دەبێ شاهیدێک بۆ خۆی پەیدا کا .جا بەو پێ وشوێنەوە وەڕێ دەکەوێ و دەگاتە لای دوستێکی و رووداوەکەی تێ دەگەیەنێ و ئەویش بەلێنی پێ دەدا کە لەلای قازی شایەدی بۆ بدا . بەلێ سەرت نەیەشێنم بەو جۆرە قەرزدار و خاوەن قەرز بەرەوبارەگای مەحکەمەی قازی وەڕێ دەکەون. قازی روو لە خاوەن قەرز دەکا و دەلێ کوڕە ئەتۆ کە داوای گەنم دەکەی شایەدت هەیە . دەلێ بەلێ قوربان ئەوەتا شایەدم.قازی روو لە شایەد دەکا و دەلێ بلێ برانم ئەتۆ شایەدی ؟

شایەد دەلێ : بەلێ قوربان ئەمن شایەدم ، ئەو دوستەی من ٢ تەغاری جۆ داوە بەو کابرایە و ئێستا حاشای لێدەکا .

قازی دەلێ:کوڕە ئەوە دەلێی چی ؟ گەنم یا جۆ ؟

شایەد دەلێ قوربان ئەمن شایەدم کارم بەوەی نیە. یانی نازانم گەنمە یا جۆ ؟

• • •

کابرای هەژار کوڕی بۆ دەرسی راهنمایی ناردە شار . کوڕە داب و نەریتی شارستانەتی دی و خوو وخدەی خۆی لەبیر چۆوە .هەرکە دەچۆوە دێ ،دەستی لە رەش و سپی نەدەدا و کاری نەدەکرد خۆی بادەدا و خۆی رادەدا ، دەیگوت : سیکلم !

بابی بەتاقی تەنێ هەموو کارێکی دەکرد .

رۆژێک گوێ درێژی کابرا مانی گرت ونەڕۆیی . کابراش توند نەقیزەکەی تێوەژاند و دەنگی دا :

هەچە هم . .تۆیش سیکلی؟!

# کۆنەهەواران

"عەدنان رەبیعی"

پاش مەرگی خاڵۆم شەرتم کرد ئیتر روو لە هەواری ئەوان نەکەمەوە وکۆنەهەواران نەبینمەوە .چون هەرگیز بەبیرمدا نەدەهات ئەو گوڵ و گوڵزارۆکانی وچیاوهەرد و هەوارە شیوەن وگریانی تێکەوێ . من کەبەچاوی خۆم دیبووم گەورەپیاوانی ئەم مەڵبەندە لەدەوری کۆدەبوو ـ نەوەوویڕای قسەوباسی شیرین لەکانیاوی ساردی هەواران چا یان ساز دەکرد و دەیانخواردەوە وبەبێن بەینێش قلیانیان دەکێشا . رۆژانی هەرەوەز یان گەلە دروێنەم دەهاتنە بەرچاو کە پیاوانی ئازاو لاوانی ئاوایی چەند بەخۆشی ئەو هەموو گەنمەیان دروو دەکرد و باخەیان دەبەست ،وکێشەیان دەکرد . ئەو کاتانەیان بە سیاچەمانە وگۆرانی وقسەی خۆش دەبردە سەر .

قووقەی کەڵەشێرو فرتەی مریشکم وەبیر دەهاتەوە کە پۆل پۆل جووچکەی جوانیان بەشوێنەوە لەدەوری کەوێل دەگەڕان .دەنگی هۆهۆ و بەرەری خاڵەی حووتیار ، قاسپە قاسپی کەوی نسار لە دەمەوبەیانی بەهاردا و ...... هەواریان زیاتردەڕازاندەوە . گفەگفی چراتۆڕی شەوانە کەبە لقی دارەگێلاسی بەر کەوێلەوە هەڵواسراوووشنەی با دەی لەراندەوە، کە بە تریفەی رووناکی دەوروبەرەی وەکوو رۆژ رووں دەکردەوە ، حێگای سەرنجی تایبەتی بوو .

شنەی بای بەیان ودیمەنی بەرزوڕازاوەی هەوارگە و حەوی شەوانە کەچاو دەبڕێتە ئاسمانی شین وپڕ ئەستێرە : هەموو جێی باسێکی جودان .

لەبارەی تەبیعەت وپاکی و خاوێنی ولەخۆ بوردوویی وئازایی پیاوژن ولاوانی ئاوایی تا بنووسرێ کەمنە . ئیتر لە شی کردنەوەی ئەو هەموو جوانی وپاکی یانەدا هەستی دەروونی من کەمە و قەڵەم لە عاستی شەرمەزارە .

پاش چوارساڵ،پێمنا بە جەرگی خۆمدا وقەرارم شکاند وبڕیارمدا کەبڕۆم وچاوێکم بەهەردوهەوارانی جارانی خاڵۆم بکەوێ .

رۆژێک بەرەو هەوار وەڕێ کەوتم . لەرێدا بیرم لەم شتانە دەکردەوە داخۆ پاش کۆچی خاڵۆ لەم چوارساڵەدا هەوار چی بەسەر هاتووە ! هەوەڵیش کاتێ دەبینم .هۆهۆ وبەرەری مامەی حووتیار ، قاسپەقاسپی‌کەوی نسار ، بارە باری مەڕوبزنی بەچە ، گوڵ و گوڵزاری بەر کەوێل و ...... هەرچی نزیکتر دەبوومەوە حەموبەژارە بتر دایدەگرتم . چون قەت وەبیرم نەدەهات ئەم حێگایە بەم چەشنە ببینمەوە .

لەنەکاو ریزەچیاری بەر هەوار دەرکەوتن.بەدیتنی گەڵای زەرد وداری وشک بەجێی سەورایی وچەتری جارانیان. چاوانم پڕبوو لەئاو. زامی دڵم کولایەوە .هەرچی دەچوومە پێشەوە بەو دیمەنانە زیاتر دڵتەنگ دەبووم .

ئەم شیعرەفۆلکلۆرەهەورامی یەم بیرهاتەوە :

**ئاروورا م کەوتەن کۆنەهەواران**
**دماو باڵاد تۆ وەشیمنەویاران**

**ئاروورام کەوتەن هەوارەبەرزە**
**من لاوکی ش بەروویی دادعەرزە**
**ئارو لووانی کۆنە هەواران**
**شادی چەن ساڵەیم بەخەمویاران**
و . . . . .

هەر بەم خەیاڵانەوە دەڕۆیشتم تا گەیشتمە بەرکەوێڵی هەواری خاڵۆم. بەڵام ئەم هەوارە وهەواری جارانی خاڵم ئاسمان وزەوی یە. ئەمجار ئیتر لەهاژەی چراتۆڕو کۆڕ و قسەی خۆش وگۆرانی و . . . . . . . باسێک نیە!

کە سەرم هەڵێنا دیم ئێوارەیە و وردە وردە ئەستێرەکان بە ئاسمانەوە دەدرەوشێنەوە. مانگەشەو تریفەی رووناکی هەڵدەڕشتە ئەوناوە.

کەورد بوومەوە، لەسەر لکی پاساری کەوێڵی وێران بایەقوشێکی درێوو نابەسەندم کەوتە بەرچاو. کەبە دەنگی ناخۆش دەیخوێند وپەردەی کپی شەوی دەدڕاند. بە چاوی گریان ودڵی غەمگینەوە لە بەرانبەری دانیشتم و گوێم بۆ راگرت. ئەویش رووی تێ کردم وهەربە گۆکۆ هەڵیدایە:

– کاکی رێبوار، ماندوو نەبی. چۆن بوو ریگات کەوتە ئێرە!

– ئەگەر بۆدیتنی ئێرە پیاوان وهەردوهەواروگوڵزاری ئێرە هاتووی خودا نەتهێنێ وقاچت بشکێ!

– ئەگەر هاتووی چایی گەرم وئاوو دۆی سارد بخۆیتەوە، شووتی وکاڵەک و خەیارۆ بخۆی، دەک بەزەهری مارت بێ!

– ئەگەر هاتووی سەیری تاوگە وشیناوەردودارستانی هەوار بکەی ئەوە خەیاڵی خاوە.

– لێرە جگە لە گەڵای زەرد وداری رەش وسووتاو هیچی تر نابینی. لەحیاتی دەنگی کەڵەشێرومامری ئاوەدانی ئێستا هۆ هۆی بایەقوشە!

– ئەگەر هاتووی پیاوان و لاوانی بەجەرگ وهەرەوەزیان ببینی، جگە لە پۆلە کۆتری مزگەوتی چۆڵ، کە لە چارە گەنمی ساڵاندا دەسوورێنەوە هیچی تر نابینی!

– ئەگەر هاتووی گێلاس و هەڵووک بخۆی، ئێستا دەنکی ئەوانە فرمێسکی چاوی رێبوارانی ئەم هەوارەیە کە بەرۆژا لێرەوە تێدەپەڕن!

– ئەگەر هاتووی لەهەواری خاڵۆ تاوێ بەخۆشی رای بوێری بەهەڵە چووی! چەند ساڵێکە ئەم کۆنە هەوارانە لەجێی هەو هەو و بەربەری جووتیاران هۆ هۆی بایەقوشان دەنگ دەداتەوە. ئەمە چەند ساڵە شێری بێشەی ئەم هەوارە بارگەیان پێچاوەتەوە ولە دەشت ونسارو کانی و هەوار ماڵ ئاوایی یان کردووە!

تاوێک بێ دەنگ بوو دیسان هۆهۆی کێشاوەوگوتی:

– ئەمە پەندی پێشینیانی کوردانە کە دەڵێ

**"یاگەی شاباز کوکوری موازا"**

منیش ئەم شیعرە جوانەی مەلای جەباریم وەبیر هاتەوە کە دەڵێ:

**"هۆهۆی بایەقوشەو وەهەردەوە**
**زام دەیرینان تازە کەردەوە"**

دەستەی نووسەرانی سروە

یەکێک لەهاوکارەکانی "سروە" ماوەیەکە تووشی نەخۆشی یەکی سەیروسەمەرە بووە. عەدەدی (٧)ی لێ بوتە رمووزن! شەوانە هەر چاو لەسەر یەک دادەنێ (٧) وەک تیرە دوولکەژەهراوی یەکەی روستەم کە ئەسفەندیاری پێ کوشت لەچاوی رادەچێ! بولای هەر دوکتورێکیش دەچێ دەست بەجێ (٧) جوری ئازمایش و (٧) جور دەرمان و (٧) روژی حەسانەوە بودەنووسێ. بەلام ئەمکارانە هەموو بێ سوودن، (٧) دەست بەرداری نەبووە وخواردن وخەوی لەدەست ئەم ژمارەپیروزە لێ هەلگیراوە!

ئەم هاوکارەخوشەویستە تا (٧) مانگ لەمەوبەر ساغوسەلیم بوو. قەت نەیدەزانی نەخوشی چیە وهەمیشە بەکەیف ولەسەر باو بوو. (٧) مانگ لەمەوبەر هاوکاری خوی لەگەل دەستەی نووسەرانی سروە دەست پێکرد. بەرە بەرە لەکزی ولەحەری دا وتووشی پەریشانی وداتەکاوی هات وسەرئەنجام ئەم نەخوشی "لەحەوت ترسان"ە رووی تێکرد. واژەی "حەوت سەرزارەکی بەم نیشانەیە (٧) دەگوترێ کە

لەرينووسي زماني كورديدا دەكار دەهينري وهاوكاران "فعل وسفەت وفاعيل" بان لي سار كردووە وەك "حەوناندن"، "نەحەويت" "محەوەت" ورۆرستي ديكەش! دوكتورەكان دەلين نەخوشي "لەناريكي ترسان"، "لەمردن ترسان"، "لەداهاتوو ترسان" "لەئازارونەخوشي ترسان"مان هەيە بەلام نەخوشي "لە حەوت ترسان" لەقامووسي پزيشكيدا نەبووە ونەنيسراوە!

من دەزانم نەخوشي ئەم هاوكارە چيە! يەكەم جار چەند وتاري تايپكراومان دايەدەستي وگوتمان لەسەر ئەويتانەي كە پيويستە (٧) داني .ئەويش زورسەوردي وتارەكاني خويندەوە و (٧)ي لەجيگاي پيويست دانا وديسان پيياندا چووە و ئەو جيگايانەي كە لەبيرچووبوون (٧)ي بودانان . پاش ئەوەي گووارەكەمان لەچاپ هاتەدەر وخوشي خوشي كەئەم ژمارەيە هەلەي كەمە ، چاوەرواني نامەي دوستان بووين . نامە يەك بەدووي يەكدا هاتن دوستيك نووسيبووي :

"بابە ئيوە لە سروە چ كارەن ! ئەم ژمارەيەم خويندەوە (٧) هەزار (٧)ي كەمە و..." يەكي ديكە نووسيبووي "وتارەكەي من (٧٧٧)حەوتي كەوتووە!" برادەريك لە كرماشانەوە نووسيبووي(٧٧٧٧٧) حەوت كەوتوون !"

پاش بلاوبوونەوەي ئەم ژمارەيە لەگەل " دەستەي نووسەران" كەلەسەريەك حەوت كەسين پەيمانمان بەست كە هەموو هيزوتوانا وهوشي خومان كوكەينەوە ونەهيلين چي ديكە خوينەراني خوشەويست گلەيي (٧)مان لي بكەن . بوژمارەي دوايي هەر وتارەي (٧) جار لە لايەن ئەم حەوت ئەندامەوە خويندرايەوە! هەزاران(٧) لەسەر هەزاران پيت وواژە هەلرژان. پيمان وابوو ئيتر تەواوە . "سروە" ئەمجار بي هەلە دەبي و دەتوانين بەسەربەرزي يەوە لەگەل خوينەران رووبەروو بين .

پاش (٧٧)روژ ئەم ژمارەش لەچاپ دەرچوو . وەك هەميشە نامە،يەك بەدواي يەكدا هاتن . يەكەم نامەمان كردەوە وبە سەرنجەوە خويندمانەوە . پيتان وايە چي نووسيبوو ! فەرموون !

" .... نازانم بوچي هەلەو قرتاندن و... لەم گووارە نابري. لەموتارەدا كە بوم ناردوون،چاپتان كردووە لە (٧٧) جيگا (٧) دانەندراوە! لەوەش خراپتر (٧)واژە رستە لەقەلەم كەوتوون !! " چەند نامەي ديشمان بەترس ولەرزەوە خويندەوە لەهەمواندا هاواري (٧) بووا " بەمجورە وردە ،وردە ترس لە (٧) گيان ولەشي هەموومانى داگرت ، بەلام ئەم ترسە لە هاوكارەكەماندا لە هەموومان زياتر بوو. هەر جيگايەك رووي تي دەكەين باس باسي كەمبووني حەوتە! زۆركەس پيمان دەلين،" ئيوە حەوت زەلام ،لە"سروە"چ دەكەن! ئەو حەوتانە بودەخون !؟ بەم جورە، نەخوشي "لە حەوت ترسان"يان "حەوتوويي" وەك كەوتوويي هەرەشە لەسلامەتي هەر حەوتمان دەكا وهەرئيستا يەكيك لە هاوكارەكانمان تووشي هاتووە! دوكتورەكانيش هيچ دەرمانيكمان پي نادەن ناچار هەموو روژي بەخومان ومال ومندالمانەوە ئەمدوعايە دەكەين :

" ئەي خوداي(٧) تەبەقەي عەرزوعاسمانان بوخاتري گەورەيي خوت ماشينيكي چاپ بەنسيب "سروە" بكەي كەخوي (٧) لەسەر پيتەكان دابني و ئەم حەوت مەزلوومەي "سروە" لەچەنگ ئەم هەمحوو گلەيي وبناشتەي خوينەراني بەريز رزگار بكەي ! ئامين "يارب العالمين ! ".

تي بيني :

**لە ترسي هاوكارە لەحەوت ترساوەكەمان ئەم وتارە بي (٧) چاپكرا . تكايە حەوتهەزار نامەي پر لە گلەييمان بومەنيرن!**

تێبینی . لەپڕکردنەوەی ئەم جەدوەلەدا هەموو ئوسوولی ڕێنووسی کوردی بەپێی ڕێنووسی هەڵبژێردراوی ئەم گۆڤارە رەچاو کراوە. جگە لە وەی نیشانەی (٧) دانەنراوە. واتا ئەکە ڕابۆ وێنە وشەی ( شڕ، گوڵ، ڕۆڕ، شێر و ... ) ی تێدا بێ بە شکڵی ( شر، گول، رور، سیر و ... ) دەنووسرێ

◀ ١- خۆی بە پێغەمبەر دەزانی و نۆشیروان کوشتی - گراوی مەم ٢ - شاعیرێکی کورد کەناوی فەقێ قادرەو شیعری "پیرەدار"ی گوتووە- پەرەنگ وپوولەکەی کۆبەی کەوا ٣- ئافەتی هەنگ - زێرو زێو - کەس وکار ٤- خمی شین - ئامرازێکی پرسیار - پلاوی بێ سەلە - دەفروئامانی لێ سازدەکرا ٥- دووپاتی بکەیەوە بەبانگ وسەلا دەگری - دۆستی خاوێن - دووجار پیتێک - گەلەپاتاڵ ٦- نیوەی ماوە- ئاوێنەی فکروهەست وخەیاڵ - تەکبیر ٧- گیای گێرەکراو - خێوی جوانی - جێ ٨- بووکی تازە- نێرەبەراز ٩- "شریت"یشی پێدەڵێن- راواندن - کوڵ - ١٠- تاری یەکەی بەخێروبێرە - داوا- سرک ورەوەک - ١١- دەغلێکە - دەریای عەرەبان - داردەری دەکا - سەوز ١٢- وەک ئەوە - بەد - ئاوەزوفام - بنسۆس و عیللەت ١٣- زیت وژیر- مێلاقی پێ هەڵداوەسن - مەڵبەند وناوچە - ١٤- رووبارێکی گەورەی دراوسێمان - هەم ناوی گوڵە هەم ناوی کچ - بەکارێز چاری دێ ١٥- کەوتووی گرێ لێ براو- پۆرگی سووتان - سەم .

▼ ١- دەڵێن کوری برایمپاشای یەمەنە- مەودای نێوان دووسەری هێڵ ٢- گەلە کۆمەگ ئاژەڵدار بەهاران رووی تێ دەکەن ٣- تێشووی زستان - کەوی - نای تورکی ٤- ژمارەیەکە- بەرهەمێکی مامۆستا هێمنی نەمر٥- ئێل وعەشیرە- لەگەڵ تان نەبێ نابێ بەکر- خواردنی کەم نایشکێنێ - هێری نێوک کەوتوو- ئەگەر بیدەیەوە نەتداوەتەوە . ٦- خانم وخاتوونی ماڵ - روانین ٧- گریانی بەقەستی -تژی ٨- خوو- هەڵرژاو- پاڵەوانی فارسان ٩- قەفەس - بێ باوک وسێوی ١٠- سەروبنی تەماتە- شارێکە لەجنووبی کوردستان مەهابادی چووە- قین وتوورەیی ١١- دەموکات - لەبن لەهجەی سنەدا هەیە- قەڵاتی مێران ١٢- دەنگی گوللەومێشوولە- تەڕ نیە- لق وپۆ ١٣- برین - باسکلاوەکەی خۆشترە- سووک وچرووک ١٤- سی سەراوبنی - لەمپەرە بەناوبانگەکەی فەرانسە- تەشتی گلێنە ١٥- چلێس - بەیچەل وئەستێور - پەز .

لەنێو ئەوکەسانەیدا کەپڕکراوەی دروستی ئەم جەدوەلەمان بۆبنێرن بەپێی قورعـــە یەک کەس بە بەرندە دەناسرێ .جابـــزەی بەرندەی جەدوەل بریتی یەلە ساڵێــــک ئابوونمانی گۆڤاری سروە .بەرەندەی جەدوەلی ژمارە ٦ خوشکە شیرین بابان بـــوو .

پڕکراوەی جەدوەلی (٧)

خەزەڵ وەرێنە ، پاییزە
گوڵ ژاکاوە ، بولبول زیزە

هەڵی کردۆتێ ڕەشەبا
لک دەشکێنێ گەڵا دەبا

پەل وگەڵای دەسەرداران
بوونە پێ شێلی ڕێبواران

هەرچی دەنازێ بە بەری
شەختە دێ ودەگاتە سەری

خۆش ئاوازەکان بێدەنگن
کەسک وسوورەکان بێ ڕەنگن

بێری بێزار بوونە لەڕان
شەوێن بەجێ ماون بێ شوان

هەوار پەپووی لێ دەخوێنێ
بێ خێوە بەردی پاڵێنێ

هەور لووتی داژەنیوە
تەماڵی بەتەم تەنیوە

بۆوەی دنیا بکاتە خەو
حوکمی داوەتە دەستی شەو

گیاندار هەموو لێک نەبانن
تا ساوی سامی زستانن

پایز قاسیدی زستانە :
"بەڕەی هەژار لە درانە"

جا بە قەولی کوردە دەڵێ
زستانیشی بێتە گەڵێ

تەیرو تووران ڕەق هەڵێنێ
سنووری خونچە بشکێنێ

شیناوەرد شپرێو وشڕکا
بگرێ ،ببرێ ، بکوژێ ، قڕکا

خۆر لە نێو هەوران بنێژێ
پزوو و ڕنووان دابڕێژێ

بووکی پەردوو پەردووگیر کا
زاوا لە هەیبەتان پیرکا

بە چلوورە وسەهۆڵ بەندان
تیر هەڵبەستێ لەسەر دوندان

پیرە لەک لەک چلوو بڕکا
کۆرپەی ساوا کوت وپڕکا

خۆبە زۆری داسەپێنێ
کۆشکی ئاواتێک بڕمێنێ

دژوارە کەس خۆ ڕاگرێ
دژ بە سەرما پێ داگرێ

لەبەر ئەو هێرشە نەبەزێ
بەم زەبرە جەرگی نەتەزێ

بەڵام بێتوو کەسێک نەمرێ
بەری ئەو هەڵمەتە بگرێ

هەتا بەم تەنگانە ڕادێ
بەهاری فەرعانەش دادێ

ح. ڕەشیدی زەرزا